# ئامۆژگاری و رێنومایییەکان بۆ گەنجانی گەڕاوە بۆ لای ...

# خوا


الشيخ

محمد بن صالح العثيمين

وەرگێرانی

حاجی فەوزیە وەلی

پێداچوونەوەی زمانی کوردی

موحسین چینی

پێداچوونەوە لە رووی ئاینییەوە

نەهرۆ علی حمد




# ئامۆژگاری و ڕێنومایییەکان
# بۆ گەنجانی گەڕاوە بۆ لای ...

# خوا

الشیخ

**محمد بن صالح العثیمین**

وەرگێڕانی

**حاجی فەوزیە وەلی**

پێداچوونەوەی زمانی کوردی

**موحسین چێنی**

پێداچوونەوە لە ڕووی ئاینییەوە

**ئەمرۆ علی حمد**





# ڕێنومایی و ئامۆژگارییەکان بۆ گەنجانی گەڕاوە بۆ لای

# خوا


زانای بەڕێز
عبدالعزیز بن عبدالله بن باز
ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ

زانای بەڕێز
محمد بن صالح العثیمین
ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ

وەرگێڕانی
فەوزیە وەلی مام وسو

پێداچوونەوەی زمانی کوردی
موحسین چینی


٢٠١٣







ناوی پەرتووك: ڕێنومایی و ئامۆژگاری

ئامادەکردنی: عبدالعزیز بن باز / محمد بن العثیمین

وەرگێڕانی: موحسین چینی

پێداچوونەوە: نهرۆ علی حمد

دیزاین: احمد سلێمان (مەریوان گرافیك)

ساڵی چاپ: ٢٠١٣ چاپی یەکەم

چاپ: چاپخانەی شەهاب – هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردنی (٣٩)ی ساڵی ٢٠١٣ی دراوەتێ



# ئامۆژگاری بۆ گەنجانی نەتەوەی موسڵمان

لە بەڕێز مامۆستا –عبدالعزیز بن باز-ەوە

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورەو درووددو سەلام لەسەر نێردراوی خوای مەزن پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) و بنەماڵەو یاوەرەکانی.

دوای سوپاس و ستایش: سەیر نییە ئەگەر، باشترین نزیکبوونەوە لەخوای پەروەردگار داواکاری زانست بێ، هەمیشە لەهۆیەکانی گرەو بردنەوەی بەهەشت بێ، هەروەها بۆ ئەو کەسەی کاریشی پێدەکات گەورەیی و سەرفرازی بێت لە ئەرکە هەرە گرنگەکانی گەڕان بەدوای زانستی نزیکبوونەوە لەخوای مەزن دڵسۆزییەو ئەمەش دەکرێ کە داواکارییەکەی بۆ خواو گەشاندنەوەی رووکاری رووی مەزنێتی داهێنانەکانی بێ نەوەك بۆ هیچ مەبەستێکی دیکە بێ، چونکە ئەمە تاکە ڕێگای قووڵبوونەوە لە زانستەو هۆی سەرەکیشە بۆ گەیشتن و بەدەستهێنانی پایەو پلە بەرزەکان لەدنیاو ئاخیرەت لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر محمد (ﷺ) هاتووە کە فەرمووی ﴿مَنْ تعلم علماً مما ینبغی به وجه الله، لا یتعلمه إلا لیصیب به غرضاً من الدنیا، لم یجد عرفُ الجنة یوم القیامة﴾ئەبو داود بە بەڵگەی چاك دەریکردووە.

(ئەوەی زانستێك فێربووە بۆ بەرەنگاربوونەوەی خوای مەزن دەیرەخسێنی و ستەم و نارەوایی و چەواشەکردنی خەڵکی دی پێدەکات و بۆ لاوازی ئایینی ئیسلام بەکاری دێنێ، ئەم زانستە تەواو



فێر نابێت کە ئامانجی تەنیا مەبەستێکی دنیایە، ئەو کەسە لەرۆژی زیندووبوونەوە بۆنی بەهەشتی بە چنگ ناکەوێت).

ترمزیش هەر بە پشتگیرییەکی لاواز لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)ئەمەی دەرهێناوە کە فەرمووی:

﴿من طلب العلم ليباهي به العلماء أو ليماري به السفهاء، أو ليصرف به وجوه الناس إليه، أدخله الله النار﴾.

(ئەوەی بەدوای زانستێك بگەرِێ تاکو خودی خۆی لە زانایان گەورەتر بزانێ و لووتبەرزی پێبکاو خۆی لە زانایان زیاتر بزانێ، یا زانستەکەی بۆ رسواکردنو گاڵتەپێکردنی خەڵك بەکارهێنا، یا بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵك بۆ مەبەستی خۆی راکێشێ خوای گەورە ئەم کەسە دەخاتە دۆزەخەوە).

ئامۆژگاری سەرجەم داواکارانی زانست دەکەم، داوا لەهەموو موسڵمانێك دەکەم زۆر بە دڵسۆزی ئاگاداری ئەم خاڵە گرنگە بن لەهەموو ئیش و کردەوەیەکیان کە لە دنیادا دەیکەن زۆر بەدڵسۆزی بۆ خوای مەزن هەوڵبدەن وەکو ئەوەی خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمووێ:

﴿ ......فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾ ﴾ الكهف: ١١٠







واتە: جا هەر کەس بە تەمایە بە خزمەت پەروەردگاری بگـات(لـە قیامەتدا) ئەوەی با کردەوەی چاك بکاتو لە پەرستنی پەروەردگاریـدا کەس نەکات بە هاوبەشی.

هەروەها ئامۆژگاری هەموو کەسێك، هەموو موسڵمانێکی کردووە ئەوەی بەدوای زانستدا عەودالە، لەخوای مەزن بترسێت و هەموو کارو کردەوەیەکی هەرچەند بچووك بێت چ ئاشکرا یان نهێنی هـەمووی لـە ژێر چاودێری خوای مەزنەو تاکو لە ئارەزووی نێو دڵیش ئاگادارە.....

هەروەکو لە فەرموودەی پەروەردگاردا هاتووە:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١٢﴾﴾الملك:١٢

واتە: ئەوانەی لە پەنهانیا لەخوای خۆیان دەترسـن، لێخۆشـبوونو پاداشتی گەورەیان بۆ هەیە.

دیسان خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾﴾الرحمن:٤٦.

واتە: بۆ ئەو کەسەی لە وێستانی بەردەمی پەروەردگاری بترسێ دوو باخی خۆشی هەیە.

هەندێ لە پێشینی چاکمان دەڵێن: سەرچاوەی زانسـت، یـا پۆپـەی زانست، یا لووتکەی، ترسە لە خوای گـەورە، بـەمانای هەرچـەند لـە



زانستی لێکدانەوەو شەرحی قورئان قووڵ ببێتـەوەو تێـی بگـەیت پـتر لەخوای مەزن دەترسێیت، عەبدوڵلای کوڕی مەسعود (خـوا لێـی رازی بێت) گوتی: زانست تـەنیا هێندەیـە کـە گەیـشتوویتە ئاسـتی تـرس لەخوای مەزن و هێندەش سوود وەرگرتن لـە نـەزانین و جەهالـەت بـا بەس بێ.

هەندێ لە پێشوویانی دیکە گوتیان: ئەوەی لەهەموو کـەس باشـتر خوا بناسێ ئەوەیە لە هـەموو کـەس پـتر لێـی دەترسـێ... ئەمـەش نیشانەی راستی ئەو مانایەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) بە یاوەرەکانی خۆی فەرموویتی: ﴿ئەی هەر ئەمەیە کە من لەهەمووتان پتر لەخوا دەترسـم و لەهەمووتان پتر خوا دەپەرستم و بڕوام پێیەتی﴾.

هەرچەند ناسین و زانیاری بەندە بەخوا پتەوبێ ئەمە دەبێتە هۆیـەك بـۆ تـەواوبوونی راسـتی و دروسـتی خـوا ناسـی و، وەسـتان و هەڵوەستەکردن لە سنووری لادان بەرەو خراپەکاری و خـۆ پـارێزی لـەو رەوشت و کردەوە خراپانەی کە لەئایـەت و فـەرموودەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) دا بەکاری ناپەسەند باس کراون.

لەبەر ئەمە خوای گەورە دەفەرمووی:

﴿...إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟﴾ فاطر:٢٨

واتە: بەڕاستی لەناو بەندەکانی خوادا تەنیا زانایان (وەك پێویـسـت) لەخوا دەترسن:







زانایان لە ناسینی خواو ئایینەکەی، لەهەموو خەڵك پتر لەخوا دەترسن، پتر خوا دەناسن و لەخەڵکی دیکەش باشتر و چاکتر ڕێبازەکەیان گرتووەو بە ئایەت و فەرموودەکانەوە پابەندن و لەسەرووی ئەمانەشەوە نێرراوو پێغەمبەرەکان دروودو سەلامی خوای گەورەیان لەسەر بێ ئینجا دوای ئەمانە ئەوانەی بە چاکی لەسەر ڕێبازەکانیان دەڕۆن و هەڵس و کەوت و کارو کردەوەیان لە شێوەی خواناسانی پێشووان دەبێ. ڕۆژانی ڕووناکی ڕێبازی ئیاینی ئیسلام هەرچەند کۆن بێ و ڕۆژگاری بەسەردا بچێ لەکە لە ناخی دڵیان ناکا، ئا ئەمانە ئەو زانایانەن کە لە هەموو کەس پتر لەخوا دەترسن و لەهەموو کەس پتر خوا دەپەرستن و هەروەها لە ڕۆژی زیندووبوونەوەش لەهەموو کەس پتر لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت.

بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری کردووینەوە نیشانەکانی بەختەوەری بەندەی بۆ دیار خستووین لە ئایینی خوا پتر بخوێنێ و، شارەزا بێ و ، لێی قووڵ ببێتەوە. پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمووێ:

﴿هەرکەسێ خوا بیەوێ لە ئاین شارەزا دەبێت و چاك دەیخوێنێتەوەو لێی قووڵ دەبێتەوە﴾. لەسەر زاری معاویە هاتووە(خوا لێی ڕازی بێت) کە لە (الصحیحین)دا دەریکردووە.



جگە لە هەموو زانست وخوێندنو خوێندنـەوەو ڕۆشـنبیری بەنـدە، خوێندن و خوێندنەوەو فێربوون و لێکۆڵینەوەو قووڵبـوون لـە زانسـتی ئاین بەندە هانـدەدا کـە بـە گـوێرەی فەرمایـشتەکانی خـوای گـەورە هەڵسوکەوت بکات و پەیڕەوی فەرموودەکان بکات و لـەخوا بترسـێت و، ئەوانـەی لـە ئـاین پێویـستن جێبـەجێیان بکـات و، لـە خراپـەو قەدەغەکراوەکانی وەکـو درۆو بوختـان و قـسەی پاشملـەو سـووکایەتی کردن و زۆر بلێـی و گاڵتـەکردن بـە زانـستی زانایـانی ئـایینی خـۆی بپارێزی، هەروەها خوێندن و لێکۆڵینەوەو قووڵبوونەوە لەزانستی ئاین بەندە فێری ڕەوشت و هەڵسوکەوتی جوان دەکات و، پەیوەندی لەگـەڵ دەوروپشتی چاك دەکات و دەیکاتـە بەندەیـەکی بـەتوانا کـە بتـوانێ ئامۆژگاری خەڵکی دی بکاتو هەروەها کە سینییەکەی پڕ زانست و زانیاری دەکات تاکو بتوانێت پێشڕەوایەتی نەتەوەی موسـڵمان بکـات بۆ ئەوەی لەکاتی ئاشتی و ئاژاوەییدا خەڵکی لـە ڕەوڕەوەی ڕۆژگـاری سەختی دووبەرەکی ڕزگار بکات.

لە خوای گەورەو شکۆمەند داواکارم کە هەموو داواکارانی زانـست و سەرجەم موسڵمانان خوێندەوارییەکی چـاکیان لـەئاین پێبەخـشێن و لەسەر ئاییینی ڕاسـت و دروسـت و سـوڕبن و لەسـەر کـردەوەی چـاك






سەردەوام بن و هەمیشە داواکارم هەموومان لە نیازی دڵپیسی بپارێزیت و لەوانەی ئاینیش بەخراپەی دەزانێ دوورمان بکاتەوە، خوا بەخشندەو توانای بەسەر هەموو شتێکەوەیە.

سەلامی خوا لەسەر بەندەو نێردراوەکەی (محمد- ﷺ-) و لەسەر بنەماڵەو یاوەرکانی.

الشیخ ابن باز [(١)]

(1) مجموع فتاوي و مقالات متنوعة للشيخ ابن باز جمع د. محمد الشويعر.







# ئەحکامەکانی تەوبە

**تەوبە:**

گەڕانەوە لەسەرپێچی خوا بۆ گوێڕایەڵی بۆ خوا.

پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێکی هۆشمەند ئەوەی بەتەنگ خوا پەرستییەکەی خۆیەوەیە، هەرچەند هەموو سات پێویستی بە تەوبەیە کەچی هەندێ کەس وا لە تەوبە دەگات وەکو ئەوەی ئیمڕۆ تەوبەی کردبێت بۆ بەیانیش لەسەر هەمان خووڕەویشت بێ بە مەبەست وا تێدەگات تەوبەکردن تەنیا بە گوتنەو ئەگەر لەڕۆژێکدا هەزار تەوبەش بکات ئەمە هەر تەوبە کردنە.....

لێرەدا پێویستمان بە روونکردنەوەو شیکردنەوەیەکی تەواوی کردەی تەوبە هەیە..

خوشك و برایانی موسڵمانی بەڕێز: تەوبەکردن تەنیا چەند وشەیەك نییە لە زاری دەربچێت.. بەڵکو تەوبە، دەکرێ، بەبێ گوتنیش بێت.. بێ ئەوەی لە دوای سەلامدانەوەی دوای نوێژ دەنگ هەڵبڕیت و داوای توبە بکەیت.. لەبەر ئەمە خوشك و برایانی موسڵمان پێویستە ئەوە بزانن کە تەوبەکردنی مرۆڤ ئەو کاتەیە کە ئەو مرۆڤە لەکاتی نەزانی و سادەییو نەخوێندەواری خۆی بەسەدان و هەزاران کردەوەی خراپی کردووەو پێی نەزانیوە ئیدی کە هۆشی بتەودەبێت لە سادەیی (قۆناغی



گەنجی) دەردەچێت و دەگاتــە پلەیــەکی چــاکی خوێنــدەواری هەســت بەسەردەمی کــۆنی خــۆی دەکــات کــە لــە ژیــانی ڕۆژانەیــدا هــەموو شتێکی، هەموو کردەوەو قسەو گفتوگۆیــەکی هەڵــە بــووە ئــەو کاتــە تەوبە دەکرێت، تەوبەکردنیش لە ژیــانی مرۆڤــدا ( گۆڕانــە) بەهــەموو مانای وشە گۆڕانە لە زەمــەن هــەروەها لــە کەســایەتی هــەروەها لــە کاروکردەوەیەك بە نیاز پاکی..

گۆڕان لە زەمەن: هەندێ خوشك و برایــانی موســڵمان ڕۆژگــارێکی دوورو درێژ، تەمەنێکی زۆریــان بەســەر بــردووە کەچــی لــەو هــەموو تەمەنە دوورو درێژە فەرمایشتەکانی ئاینییان زۆر بە ساکاری جێبەجێ کردووە، بۆ نموونە نوێژەکانیان لەکاتی خــۆی نــەکردووە بــەمانای دوای بانگدان لەماڵەوە چوونە دەرەوە، یا لە گازینۆ هەڵساون بە لەشی گران ڕوویان لەمزگەوت کردووە، یا ئەوەتا لەو تەمەنە دوورو درێژە زەکــاتی لە ماڵی خۆی دەرنەکردووە، یا هــەبوون بــووەو یارمــەتی کەســوکاری خۆی و دراوسێیەکانی خۆی نەداوە... هەر لــەو تەمەنــەش نــەیزانیوە بەڕۆژووبوون ئەحکامی خۆی هەیەو لەو مانگە پیرۆزە پێویستە خوشك و برایانی موسڵمان ئاگاداری بیستنی خۆیان بن کە گوێ لــە گۆرانییــە سووکەکان نەگرن، ئاگایان لە چاوەکانی خۆیان بێت کە ســەیری شــتە نەهیکراوەکان نەکەن، ئاگاداری زاری خۆیان بن درۆ نەکەن، پاشملە بــە







سووکی باسی خەڵکی دی موسڵمان نەکەن، سووکایەتی بەزانایانی ئاین نەکەن.

هەروەها لەماوەی سەردەمی پێش تەوبەکردن، ماوەیەکی دوورو درێژ لە تەمەنی مرۆڤ بەسەر دەچێت لەو تەمەنە سەیر دەکەیت برایانی موسڵمان هەیە هاوڕێیەتی و دۆستایەتی لەگەڵ چەند کەسانێك هەیەو ئەوانیش ئایینەکەیان بە لاوازی گرتووەو ماوەیەکی ئێجگار زۆر لە ژیانی خۆی بە رابواردن و گەشتکردنو شتی پڕو پووچ بەسەر بردووە.

<u>گۆڕانی کەسایەتی:</u> هەر مرۆڤێکی موسڵمان چ لە تەمەنێکی زوو یا درەنگ کە تەوبە دەکات، پێویستە هەموو ژیانی بگۆڕێت. وەکو ئەوەی کە دەڵێت ئای من لەکاتی خۆیدا وا بووم یا نەزان بووم. یەکەمین جار تەوبەکار پێویستە هاوڕێیەکانی خۆی بگۆڕێت بەمانای لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ هاوڕێیە کۆنەکان گەشتی دەرەوەی شار رێکبخەن و لەنێو گەشتیاران هاتوچۆ بکەن سەیری ئەم و ئەو بکەن لەگەڵ هاوڕێیە نوێیەکان هاتوچۆیەکی رێکو پێکی مزگەوت دەکات و پێش نوێژکردن دەست بە قورئان خوێندن دەکات. بە گۆڕینی هاوڕێ و جێ و شوێن مرۆڤی موسڵمان کەسێتییەك پەیدا دەکات کە لەنێو خەڵکی دی رێزی لێبگیرێت و خەڵکی دی لە هەڵسوکەوتی پەند وەربگرن.







ئیدی هەر کە مرۆڤی موسڵمان تەوبەی ڕاستی کردو هاوڕێیەتی کەسانی چاکی کرد خۆی لەخۆیدا هەست بە خۆی دەکات ڕۆژ بەڕۆژ پتر لە جێبەجێکردنی فەرمایشتەکانی دیکەی ئایین نزیک دەبێتەوە تا دەگاتە ئەو کاتەی هەندێ جار کە سەردەمی کۆنی خۆی بەبیر دێتەوەو لە کارو کردەوەکانی پێشوو پەشیمان دەبێتەوە ئیدی دەگاتە ئەو رادەیەی ئەو شوێنانەی هاوڕێیەکانی پێشووی لێبوو روویان تێناکاتەوە.

## کاروکردەوە بەنیاز پاکی:

مەبەست لە کاروکردەوە بە نیازپاکی ئەوەیە کە خوشك و برایانی موسڵمان دوای تەوبەکردن هەموو دەمێك هەست بکات کەخوای گەورە چاودێریەتی، بەمانای هەموو فەرمایشتەکانی ئایین بەدڵ و دەروونێکی ساف و بەنیازی پاك جێبەجێ بکات... بەداخەوە کە کۆمەڵی موسڵمانمان بەڕێژەیەکی زۆر گەورە نەخوێندەوارن، بەڕاستیش گەڕانەوەی کەسێك بۆ ئایین دوای تەمەنێکی ٥٠ یا ٦٠ساڵی پێویستی بە خوێندەوارییەکی زۆر چاك هەیە، مەبەستم ئەوە نییە کە تەنیا خوێندەوار بێت یاخاوەن بڕوانامە بێت... مەبەست ئەوەیە کە خوێندەوارییەکی زۆر چاکی لە قورئانی پیرۆز هەبێ، ووردبین بێت و



لەماناکان قووڵ بێتەوە.. هەڵبەتە چەندیش لـە قورئـان قـووڵ بێتـەوە هێندە لە خوای گـەورە دەترسـێیت، هـەر چـەند لـە خـوای گـەورەش بترسێیت، هێندە دڵ و دەروونت ساف دەبێت و پاک دەبێتەوە.

تەوبەکار لەلای خوای گەورە خۆشەویستە:

﴿.......إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾البقرە: ٢٢

واتە: بەڕاستی خـوا تەوبـەکارانی خـۆش دەوێـت و پاکـانی خـۆش دەوێت.

تەوبە لەسەر هەموو ئیماندارێك پێویستە:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا ﴾التحریم:٨.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا، بـە گەڕانەوەیەکی ئێجگاری.

تەوبە  یەکێك لەهۆیەکانی رزگاربوونە:



﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾النور: ٣١.

واتە: هەمووتان توبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەی ئیماندارەکان، تا رزگارو سەرکەوتوو بن.

رزگاربوون ئەوەیە کە مرۆڤ ئەوەی دەویەوێ و دڵی بۆ دەچێت بەچنگی بکەوێت و هەروەها لەوەی لێی دەترسێ قوتار ببێت.

تەوبەکردنی ئێجگاری خوای گەوردو میهرەبان لەهەموو گوناهێکت هەرچەند گەورە بێت یا زۆر بێت لێت دەبوورێت و گوناهەکانت لەسەر لادەدا.

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر:٥٣.

واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ)بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە، نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا، چونکە بێگومان خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت، بەڕاستی هەر ئەو لێبووردەی بە بەزەییە.







ئـەی خوشـك و برایـانی تاوانبـار، ئەگـەر تاوانێکتـان کردبـێ چ گەورەبێ یا بچووك، زۆر بێ یا کـەم لـە بـەزەیی و بەخـشینی خـوای میهرەبان بێ ئومێد مەبن چونکە دەرگای تەوبـەکردن تـاکو خـۆر لـە رۆژئاوایەکانی خۆی هەڵدێت ئەم دەرگایە هەر والآیە..

خوشك و برایانی موسڵمان سەیری ئەم زەمەنـە بکـە کـە دەرگـای تویەکردن تێیدا والآیە، سەیرکە، باسـی خۆرهـەڵاتن دەکـاو هـەروەها باسی خۆرئاوا دەکـا، بـەواتای هـەر کاتێـك بتـەوێت تەوبـە بکـەیت تەوبەکەت لێوەردەگیرێت و قبووڵ دەکرێت.

پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی: خـوای گـەورەو میهرەبـان بـە شـەو دەرگـای خـۆی والآ کـردووە تـاکو بـەدکارانی رۆژێ تەوبـە بکـەن و، بەرۆژیش تاکو خۆر لە رۆژئاوا هەڵدێ بۆ ئەوەی شەوێ تەوبە بکەن.

کەواتە هەموو دەمێك، هەموو سات و وەختێـك، شـەوبێ یـا رۆژ بێ، دەرگای خوای پەخشندەو بەزییدارترینی بەزەییـداران والآیـە، بـۆ تەوبەکاران هەموو دەمێك والآیە، ئەی خودایە هەر تۆ تاك و تـەنیای، هەر تۆ زاناو شـارەزای هـەر تـۆ خوڵقینـەری سـەرجەم گەردیلـەکانی گەردوونیت، تۆ لەهەموو شت ئاگاداری، لەمردوو لەزیندوو. زیندووان دەمرێنیت و مردووان زیندوو دەکەیتەوە. هەر تۆ چاودێری ناخی دڵـی هـەموو زینـدەوەرێکی، تـۆ بلێـی تـاکو ئێـستا چـەند تەوبـەکارت









بەخشیوەو چەندین ستەمکاری تەوبەکاریشت بە بۆنی بەهەشت شاد کردووە.

خوای گەورە فەرمووی:

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان:٦٨-٧٠:

واتە: وە کەسانێکن کە لەگەڵ خودا ناپەرستن، هیچ پەرستراوێکی دی، و ناکوژن، هیچ کەسێ کە خوا کوشتنی ئەوی یاساغ -حەرام- کردووە، بەهەق و ڕەوا نەبێ، وە زیناو داوێن پیسی ناکەن، وە هەر کەس ئەو تاوانە بکات کە -باسکراون-، تووشی تۆڵەکەی دێت، سزای بۆ چەند بارە دەکرێتەوە، لەڕۆژی قیامەتداو، بێ بڕانەوە بەبێ ڕێزو ڕسوایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە، بێجگە لە کەسێ تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێ کارو کردەوەی چاکیشی کردبێت، ئا ئەوانە، خوا خراپەو تاوانەکانیان دەگۆڕێت بە چاکە، وە خوا هەمیشە لێبووردەی بەبەزەییە.



تەوبەی ئێجگاریش پێنج مەرجی تێیدا کۆبووەتەوە:

یەکەمین: دڵسۆزی بۆ خوای گەورە بەمەبەستی لە بەخشینی خۆی بێبەشی نەکاتو هەمیشە لە سزایەکەشی رزگار بێت.

دووەمین: پەشیمانبوونەوە لە یاخیبوونەکەی خۆی بەشێوەیەك لەکاروکردەوە بەدەکانی خۆی غەمگین بێت و ئومێدی ئەوە بکا کە نەیکردایە.

سێیەمین: یەکسەر واز لە یاخیبوونەکەی خۆی بێنێ... لەهەموو حاڵەتێکیشدا تەوبەکردن گۆڕانە لە خودی مرۆڤ بەرادەی ١٨٠ پلە.

چوارەمین: بڕیاری تەواو بداو توانای ئەوەشی هەبێ کە لە پاشەڕۆژ دووبارە نەگەڕێتەوە سەر رەوشتە خراپەکانی پێشوی.

پێنجەمین: هەڵبەتە تەوبەکردن ناکرێ لە ساتو وەختێك بێ کە ماوەی تەوبە نەما بێ وەکو سەرەمەرگ یا ئەو کاتەی خۆر لە رۆژئاوا هەڵدێ.

خوای گەورە فەرمووی:

﴿ وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّى تُبْتُ ٱلْـَٔـٰنَ ﴾ النساء: ١٨






واتە: پەشیمانی (وەرگرتن) نییە، بۆ ئەوانەی توانای زۆر دەکەن، هەتا کاتی سەرەمەرگی یەکێکیان دێ، دەڵێت: بەڕاستی من ئێستا تەوبەم کرد، وە بۆ ئەوانەش نییە، کە دەمرن بەبێ بڕوایی، ئەوانەی (باس کران) ئامادەمان کردووە بۆیان، سزایەکی ئازاردەر.

هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

﴿ئەوەی بەر لەوەی خۆر لە رۆژئاوا هەڵبێ تەوبەی کردووە خوای گەورە تەوبەکەی لێوەرگرتووە-قبووڵی کردووە﴾ موسلیم گێڕاویەتەوە.

ئەی خوای بەخشندەو میهرەبان، ئەی بەزەییترینی بەزەییداران، لە تەوبەی راست و دروست و ئێجگاری سەرکەوتوو و سەرفرازاو بەختەوەرمان بکەیت لە بەمیهرەبانی خۆت نائومێدو بێ بەشمان نەکەیت، ئەی خوایە، بەگەورەیی و شکۆمەندی خۆت کە هیچ خوایەك لە تۆ گەورەترو شکۆدارتر نییە نەکەست لێ دەبێ و نەکەست لێ بووە، ئەی خودایە هەر تۆ تاك و تەنیایت، بەزەبوونیو کەساسی خۆمان، بەندەیەکی بێ تواناو دەسەڵات، داواکارم تەوبەی ئێجگارەکیمان لێ وەرگریت هەر تۆ هەموو شتێك دەبیستیت و شارەزاو زانایت.

نووسینی: محمد الصالح العثيمين







## تەوبە دەرگای والایە

پرسیار: شەیتانی نەگریس هەڵیخەڵەتاندم و تاوانی زینام کردو منیش بەخۆم دەزانم کە ئەوە تاوانێکی گەورەو ناشرینی پڕ لە شووردیی بووەو دەمەوێت بۆ خوای گەورەو خاوەن بەزەیی تەوبە بکەم، ئایا خوای گەورە ئەم تەوبەیەم لێوەردەگرێت، ئەوەی راستیش بێت من ئەو کاتە دەمگوت: ئیشەکەی دەکەم ئینجا تەوبەی دەکەم، ئایا لەم حاڵەتە ئەم تەوبەیە بۆ من دەشێ؟

وەڵام: تەوبەکردن هەر لەو کاتەی خۆر لە رۆژئاوایەکانی خۆیەوە هەڵدێ دەرگای تەوبە کراوەتەوە هەر کەسێك تەوبەی ئێجگاری بکات هاوبەشکار بۆ خوای تاك و تەنیا پەیدا نەکات خوای گەورە بە تەوبەکردنەکەی قایل دەبێت.

تەوبەی ئێجگاری بریتییە لە:

وازهێنان لە کاروکردەوە گوناهەکان: پەشیمانی لەسەر ئەوانەی پێشتر کردووتە، بڕیاردانی راستو دروست کە جارێکی دی نەگەڕێیتەوە حاڵەتی پێشتر، ئەمەش بەوەی لەخوای گەورە بترسێیتو هەموو دەمێك لێی بپارێیتەوەو کڕنۆشی بۆ بەریت تاکو لە گوناهەکانی پێشووت خۆش بێت.

هەروەکو خوای گەورە میراتگرو وارسی هەموو شتێکە فەرمووی:







﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا ﴾التحريم: ٨.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بە گەڕانەوەیەکی ئێجگاری.

خوای بەسۆزو بە بەزەیی فەرمووی:

﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾النور: ٣١.

واتە: هەمووتان توبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەی ئیمانداران، تا رزگارو سەرکەوتوو بن.

دیسان خوای خاوەن موڵك و دەسەڵات فەرمووی:

﴿ ۞ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر:٥٣.

واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە، نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی







خوا، چونکە بێگومان خوا لــە هــەموو گوناهــەکانتان خــۆش دەبێــت، بەڕاستی هەر ئەو لێبوردەی بە بەزەییە.

زانایان رێککەوتوون کە ئەم ئایەتە دەربارەی تەوبەکاران دابەزیوە. لەسەر ئەم سێ مەرجانەی باسمان کرد بۆ راســتی و دروســتی تەوبــەی ئێجگاری مەرجی چوارەم زێدە دەبێتەوە ئەمەش ئەگــەر هــاتوو مــافی خەڵکی دیکەی لەسەر بێ. ئەویش ئەوەیە:

مافیان لە ماڵ و شتی دی بۆ بگەڕێنێتەوە یا لە ماڵ و شتی دیکە گەردنی خۆی پێیان ئازاد بکا(بۆیان حەڵاڵ بکا).

لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): ﴿ئەوەی ستەمێکی لە برایەك یــا کەسێکی دی کردبێت، با بەر لەوەی بگاتە سەرەمەرگ ماڵ یا شتێکی دی بۆ حەڵاڵ بکات و گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات ئەگەرنا، هێنــدەی ستەمەکەی کردووە چاکەکانی لێوەردەگیرێت، ئینجا ئەگــەر کــردەوەی چاکیشی نەبوو، هێندەی ستەمەکە کردەوەی خراپ لە ســەر کەســەکە هەڵدەگیرێت و دەخرێتە ئەستۆی ئەو﴾.(اخرجه البخاري في صحيحه)

پێویستە لەسەر موسڵمان خۆی لە کردەوەی خــراپ دوور بکاتــەوە، لەو هەڵــسوکەوت و خوڕەوشــتانەی خــوا پێــی ناخۆشــە خــۆی تــاقی نەکاتەوەو لەو دۆستو هاورێیانــەش خــۆی بپارێزێــت و خــودی خــۆی بەزانستی ئایین رۆشنبیر بکات تاکو لەهەندێ هەڵوێــست و دانیــشتنی






بی ناکامی کازینۆیەکان پارێزی لە فەرموودەو فەرمایشتەکان بکـاتو دەمی خۆی وەکـو تەڵـەی تـەقیو بەرانبـەر هێرشـی نـەزانو نـەفامان دانەخاتو بەدیالۆکی هێمن ئامۆژگارییان بکـاتو بیـان گەڕێنێتـەوە سـەر ڕێگـای ڕاسـت. چـونکە هـەر هـەڵزەڵێنێك لـە فـەرموودەو فەرمایشتەکان گەڕانەوەی بۆ نییە لەوانەشە لە تەوبەکردن سەرکەوتوو نەبێت بۆیە لە هەموو ئەوەی خوای گەورە حەڕامی کـردووە پێویـستە زۆر بەوردی لێی دوور بکەوینەوەو شەوو ڕۆژ لەخوای مەزن بپارێینـەوە کە لەم کردەوە حەڕامانـە بمانپارێزێـت و لـەنیازو بڕیارەکـانی خۆمـان سڵمان نەکاتەوەو بـەرەو هەڵـدێری یاخیبوونمـان نـەبات و بێگومـان هەندێ جار شەیتان دەوروبەری کاری خراپمان بۆ دەڕازێنێتەوە گوایە کە دواتر تەوبەی دەکەین، لەوانەش بەنـدە لـەم سـاتو وەختانـە دەگاتـە ئەودی ماوەی تەوبەکردنی نەمێنێت و تووشـی پەشـیمانییەکی گـەورە ببێتەوە کاتێ کە پەشیمانی دادی نادا.

خوای مەزن و خاوەن دەسەڵات کە لەهەموو سـیفەتێکدا خـۆی بـە گەورە دەزانێت، دەفەرموێ:

﴿ وَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴾ البقرە:٤٠.

واتە: هەر لەمن بترسێن.



هەمدیسان خوای مەزن کە کۆڵەگەی ڕاستو دروستی هێمنیو ئاسوودەییە، فەرمووی:

﴿ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ﴾ آل عمران :٢٨

واتە: خوا دەتانترسێنێت لە سزای خۆی.

خوای گەورە کە هەم بیسەرو هەمیش بینەر، فەرمووی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾ فاطر: ٥-٦

واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە، دەی کەواتە با ژیانی دنیا فریوتان نەدات، وە با شەیتان بە (بەزەیی و لێبووردەیی) خوا فریوتان نەدات، بەراستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە؛ دەی کەواتە ئێوەش بەدوژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان ئەو(شەیتان) تاقمو کۆمەڵەی بانگ دەکات، بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی (دۆزەخ).

ئیدی دەربارەی مانای تەوبەکردن زۆر ئایەت و فەرموودە هەیە.

(الشیخ ابن باز)







# چۆنیەتی رزگاربوون لە سەرپێچی و گوناهەکان

پرسیار: من قوتابیم لە قۆناغی ئامادەیی، پێشتر خاوەن هەڵسوکەوتێکی چاك بووم و بە زۆر رەوشتی جوانی ژیانی رۆژانەی کۆمەڵاتییەوە پابەند بووم، وەکو ئەوەی بە پێی توانا یارمەتی خەڵکی کەمدەرامەتم دەداو لە درۆ و زمانپیسی دوور بوومو لە بۆنە ئاینییەکان ئامادە دەبوومو چەند هاورێی خواناسو راستگۆم هەبوو و زۆر حەزیشم لە خوێندنەوەی زانستە ئاینییەکان دەکرد کەچی لەپڕ ئەم دنیایەم لێ گۆڕاو کەوتمە دنیایەکی دی، چەند دۆست و هاورێی خراپم بۆ پەیدابوونو، دەستم بەکاری هێنانەوەی مەنی بەدەستی و زینا و نێربازی کردو، هەمیشە کچانی خاوەن رەوشتی جوانی خەڵکیم فریو دەداو یاریم بە لەشیان دەکرد و سەیری شوێنە جوانەکانی کچ و ئافرەتانی دراوسێی خۆمانم دەکردو، لەبەر چاوان خۆم بە کوڕێکی ئیماندار و قورئان خوێن نیشان دەداو، لە قوتابخانە بەدرۆ هاوکاری کاروباری کۆمەڵە ئیسلامییەکانم دەکرد و هاتوچۆی مزگەوتم دەکردو لە ژێرەوەش ئەوەی کاری هەرە خراپ بوو و خوای گەورە پێی ناخۆش بوو لێی نەدەپەنگیمەوە زۆر کەرەت ویستم واز لەم خراپەکارییانە بهێنم کەچی چەندەی هەوڵمدا دا نەمتوانی.. بەرێز، دەرمانێکم دەوێ






ئەم دەردەم تیمار بکاو لەخواو پێغەمبەر (ﷺ) نزیکم بکاتەوە ئۆقرەم نەماوە حەز دەکەم هەرچەندە زووە زووتر بەڕێزتان چارەیەکم بۆ بکەن.

وەڵام: لەخوای گەورە بپاڕێوەو بەناوە جوانەکانی و سیفاتە بەرزەکانی داوای لێبکە کە تەوبەی ئێجگاریت لێوەرگرێت و پێی قایل بێت و دڵ و دەروونت بۆ شتە چاکەکان والاّ بکاتەوەو بەرانبەر فەرموودەو فەرمایشتە ئاینیەکان ویژدانت بورووژێنێتەوەو هاوڕێی دڵسۆزو ئیماندارت بۆ بدۆزێتەوەو هەمیشە لەبرادەرانی خراپ بتپارێزێت. لەگەڵ ئەمانەش ئامۆژگاری تەوبەی ئیجگاریت دەکەم کە سێ مەسەلەی گرنگ دەگرێتەوە:

١ پەشیمانبوونەوە لە سەرجەم کاروکردەوە نادروستەکانی پێشوو.

٢ ترسی بێ شومار لە خواو گەورەییەکەی.

٣ خۆپاککردنەوەو بڕیاردان کە جارێکی دی نەگەڕێیتەوە سەر کردەوی خراپ ئەمەش بەدڵسۆزبوون دەکرێت کە بەرانبەر بەخشینەکانی خوای گەورە هەموو دەم خۆت بە بەندەیەکی بێ هێزو بێ دەسەڵات نیشان بدەیت.

کەی ئەمانەت بەگشتی جێبەجێ کرد مزگێنیت دەدەمێ کە خوای داناو لێزان لە هەموو گوناهەکانت خۆشدەبێ و لەو دنیاش ئاکامی خواناسینەکەت باش دەبێت.



ئـەی خـوای گـەورە، بـە بـەزەیی‌و میهرەبـانی خـۆت، چـاو لـە گوناهەکانمان بپۆشـە تەوبـەی ئێجگاریـان لێـوەرگرە، دڵ و دەروونمـان لەگوناهەکان خاوێن بکەوە تاکو جێی گەورەیی تـۆی تێـدا ببێتـەوەو ئەی خودایە بەرانبەر داهێنەکانت ئێمەی بەندەی نەزان‌و نەفام سـوژدە بەرین کڕنۆش بەرین ئـەی لـە هـەموو بـەرزان بـەرزتر، لـە هـەموو پایەداران پایەدارتر، ئەی بەرزو بەڕێزو دسەڵاتدار.

-الشيخ ابن باز-





# وریابە یاوەری خراپەکاران مەکە

پرسیار: من گەنجێکم تەمەنم نۆزدە ساڵەو ئەوەی کاری خراپە کردوومە، لەهەموو رەوشتی جوانی گەنجانی موسڵمان دوورکەوتوومەتەوە، بەڕادەیەك نوێژ لەمزگەوت ناکەم و، بەدرێژایی تەمەنم لەمانگی رەمەزان تەواوی رۆژووەکانم نەگرتووەو، هەر لەو مانگانەش خۆم لەکارە خراپەکان نەپاراستووە، زۆر قسەو کردەوەی ناشرین و ناپەسەندم کردووە، زۆر جاریش لەگەڵ خودی خۆم پەیمانم داوە کە تەوبە بکەم، کەچی دڵ و دەروونی پیسم بەرگەی پەیمانەکەی نەگرتووەو سەرلەنوێ بۆ کردەوەی نابەجێ گەڕاومەتەوە، من لە گەڕەکەکەی خۆمان سەرتاپای هاوڕێیەکانم خراپن ئەوەی فەرموودەی خوای گەورەیەو رەوشتی جوانی گەنجی موسڵمانە ئەوانە لێی دوورن و هەمیشە برایەکانی دیکەشم هاوڕێیەکانیان خراپن. دێنەماڵی ئێمەو لەگەڵ برایەکانم دەست بەقسەی نابەجێ و ناشیرین دەکەن ئەوانیش گەنجی خراپن کاری چاك ناکەن، خوای گەورە هەر بەخۆی دەزانی کە من چەند ئیشی خراپم کردووەو کردەوەی ناشیرینم کردووەو لە هەموویان پەشیمانم بەڵام چی بکەم هەر چەند بەڵێن دەدەم کە تەوبە بکەم سەرلەنوێ جارێکی دی خۆم لەنێو گۆمی بەدکاری دەبینمەوە،



تکایە ڕێگایەکم بۆ دەستنیشان بکەن ڕێگایەکی ڕاست تاکو لەخوای گەورەو مەزن نزیکم بکاتەوە ئەو خوایەی کە زانای شتی بەرچاوو نەبینراوەکانە، خاوەن شکۆیەکی بێ ئەندازەیە، ڕێگایەك فریام بکەوێ تاکو لەم کردەوە ناشیرین‌و ناپەسەندانە دوورم بخاتەوە.

وەڵام: خوای پارێزەری گشت دروستکراوو داهێنەرەکان دەفەرمووێت:

﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر:٥٣.

واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە، نائومێد مەبن لەمیهرەبانی و بەزەیی خوا، چونکە بێگومان خوا لەهەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت، بەڕاستی هەر ئەوە لێبووردەی بە بەزەیی یە.

زانایەکان بەگشتی لەسەر ئەمە ڕێککەوتوون کە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەربارەی تەوبەکاران دابەزیوە.



ئەوەی لەگوناهەکانی خۆی تەوبە بکات تەوبــەکردنێکی ئێجگـاری خوای مەزن بەگوێرەی ئەم ئایەتە پیرۆزە لە سەرجەم گوناهەکانی خۆش دەبێت.

هەمیشە خوای چاودێری پارێزەر دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾التحريم: ٨.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بگەڕێنــەوە بــۆ لای خــوا، بــە گەڕانەوەیەکی ئێجگاری. تا پــەروەردگارتان لــە گوناهــەکانتان خــۆش ببێ، وە بتانخاتە ناو باخاتێکەوە، کە بەژێریانــدا جۆگــەو ئــاوێکی زۆر دەڕوا.

خوای گەورەو میهرەبان لەم ئایەتە پیرۆزە بەندەی خــۆی هۆشــیاری کردووەتەوە لەکردەوەی خراپ و ناپەسەندەکانو چوونە نێــو بەهەشــتی بە تەوبەی ئێجگاری بەستووەتەوە، بێگومان ئەمەش ئەوە دەگرێتــەوە کە مرۆڤ بەتەواوی‌و ئێجگاری تەوبە بکات، نــاو بڕەیــەك بێــت ژیــانی مرۆڤ لێکبترازێنێت سەردەمی جەهالەت و بەدکاری بــۆ ســەردەمێکی دیکەی نوێ، سەردەمێك تێیدا خودی خۆی ڕۆشنبیر بکــات و لــەخوای



گەورە نزیك ببێتەوە كە هەموو نزیكبوونەوەیەك پلەیەكی سەركەوتنە لە ترسی بێ شومار لەخوای گەورە. هەمیشە گەنجی موسڵمان دوای تەوبە پێویستە لە كاروكردەوەكانی ژیانی رۆژانەی خۆی پتر هۆشیار بێ لەو سەردەمانەی تێیدا جاهیل و نەفام بووەو كردەوەی ناشیرین و بەدڕەوشتی كردووە دەبێ لێی پەشیمان ببێتەوە پەشیمانبوونەوەیەك لە ئاستیدا هەست بەشەرمەزاری بكاتەوە، دەبێ واز لەو شوێنانە بێنێت كە پێشتر بە چەند سەعات تێیدا بەبێ سوود دەمایەوە، هەمیشە ئەو هاوڕێیانەی كە پێشتر هاوڕێ ی بوون ئەگەر بتوانێت كاریان تێبكاتو بە دیالۆك و بەڵگەی پەسەند بیانهێنێتە سەر رێگای راست و ئەگەر نا دەبێ وازیان لێبێنێت و ئەو شوێنانەی ئەو هاوڕێیانە لێی دادەنیشن پێویستە ئەو سەر بەو شوێنانە دانەگرێ.

شاراوەش نییە كە هەموو گۆڕانێك لە ژیانی مرۆڤ نیازهێنانێكی تەواو و بڕیاری بەجێی دەوێ، ئینجا ئەگەر ئەم نیازە تەواوەو بڕیارە بەجێیە بۆ پەرستنی خوای مەزن بێت بێگومان خوای گەورەش كە لەهەموو شتێك ئاگادارەو هیچ شتێكی لێ وون نابێت یارمەتیت دەدات و ورەت بەرز دەكاتەوە تاكو بەنیازو بڕیارەكەی خۆت پابەند بیت، خوای گەورەش هەر بەخۆی بەتەنیا، لەهەر شتێكی ئەنجامی دەدەین چ بچووك بێ یا گەورە، تەنیا بەخۆی چاودێرو شاهێدە.



هەروەها تەوبەی ئێجگاری مەرجی دیکەشی هەیە ئەویش ئەوەیە کە لەسەردەمی پێشتر بەمانای پێش تەوبە ستەمێکت لە کەسێك کردبێت، پێویستە دوای تەوبە ئەو ستەمە لەسەر خۆت هەلگریت، ئەگەر ستەمەکە خوێن یا ماڵ و سامان یا ناموس بوو دەبێ ستەملێکراو بەشتی بەرانبەر قایل بکرێ و شتە بەرانبەرەکەی بۆ حەلاڵ بکرێ ئێنجا ئەگەر ستەمەکە لەناموس بوو ئەوەی بەرانبەر داوای زۆر شتی کردوو، نەکرا شتی بۆ حەلاڵ بکرێ، لەو کاتە چاکەو خێراتی مرۆڤ، خراپەکان دەسڕێتەوە.

خوای دلۆڤان دەفەرمووێت:

﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣١ ﴾ النور: ٣١.

واتە: هەمووتان توبە بکەنو بگەڕێنەوەبۆ لای خوا، ئەی ئیماندارەکان، تا رزگارو سەرکەوتووبن.

خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزە رزگاربوونو قوتاربوونی گەنجی موسلمانی لەم دنیایە شوومە بەتەوبەکردن دەرگای بەهەشتی بۆ والاکردووەتەوەو تەوبەکاری بە مرۆڤی رووخۆش و بەختەوەر نیشان داوەو ئەوەی تەوبەی ئێجگاریش بکات بڕوای بەخوای تاك و تەنیاو







پێغەمبەر(ﷺ) هەبێ و بەراست و دروستی بیانناسێ و بیانپارێزێ بۆ بەرزی ئاڵای ئیسلام هەوڵبدات گومانی تێدا نییە خوای گەورەش هەموو خراپەکانی بەچاکە دەگۆڕێتەوە.

لەگەڵ ئەمانەش خوای بەخشندەو میهرەبان ئەو بەندەی خۆی خۆش دەوێت کە لە گوناه و تاوانەکانی خۆی پەشیمان دەبێتەوە... خوای گەورەو مەزن زۆر میهرەبان و بەسۆزو خۆشەویستە.

هەروەکو خوای مەزن و شکۆدار لە سوورەتی –الفرقان-دەربارەی هاوبەشی بۆخواو کوشتنی بەناڕەواو زیناکردن دەفەرموێت:

﴿ ......وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان: ٦٨-٧٠.

واتە: وە هەرکەس ئەو تاوانانە بکات (کە باسکران)، تووشی تۆڵەکەی دێت، سزای بۆ چەند بارە دەکرێتەوە، لە ڕۆژی قیامەتداو، بێ بڕانەوە بەبێ ڕێزو ریسوایی لە دۆزەخدا دەمینێتەوە، بێجگە لە کەسێ تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێ، کاروکردەوەی چاکیشی کردبێت، ئا



ئەوانە، خوا خراپەو تاوانەکانیان بەچاکە دەگۆڕێت، وە خـوا هەمیـشە لێبووردەی بە بەزەیی یە.

لە هۆیەکانی تەوبە: پاڕانەوەو نووزانەوە، سوژدەبردن، کڕنۆش بردن بەرانبەر سیمای خوای گـەورەو داوای لێبکـەیت ڕێگـای تەوبـەت بـۆ خۆش بکات بتوانیت بە تەوبەکە بەهەشت مسۆگەر بکەیت و لە خوای گەورەو میهرەبانیش بپاڕێیتەوەو داوای لێبکەیت کـە ئـەم تەوبەیـەت تەوبـەی ئێجگـاری بێـت، تەوبەیـەك بێـت ئاسـۆی دنیایـەکی نوێـت بکرێتەوە، درۆو ساختە نەکەیتو ڕۆشنبیری ئایینی خۆت پتر بکەیتو لە هاوڕێی خراپ دووربکەویتەوەو سەردانی خزم و هاوڕێیە چـاکەکانی خۆت بکەیتو نەخۆشان بەسەربکەیتەوە، ئەگەر ماڵ و سامانت هەبوو یارمەتی هەتیوو هەژارو برسییان بدەیت و لەبازرگانیدا دەستپاك بیتو ئازاری دراوسێت نەدەیت و ئەوەی خوو ڕەوشتی جوانە پەیڕەو بکـەیت و هەوڵ بەدەیت هاوڕێیـانی چەواشـەکراو بگەڕێنیتـەوە سـەر ڕێگـای ڕاست بەڵکو خوای گەورە تەوبەکەت لیّ وەربگریّ و لـە گوناهـەکانت خۆش بێت.







هەمیشە خوای مەزن کە زیندووەو بەردەوامەو هەتا هەتایی ماوەو نەمرە دەفەرمووێت:

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ ﴾غافر: ٦٠

واتە: لێم بپاڕێینەوە، وەڵامتان دەدەمەوە.

دیسان خوای گەورەو میهرەبان دەفەرمووێت:

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌۖ أُجِيبُ دَعۡوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِۖ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لِي وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ ١٨٦ ﴾البقرە: ١٨٦

واتە: هەر دەمێ بەندەکانی من پرسیاریان لێ کردیت دەربارەی من، ئەوە بێگومان من لێیانەوە نزیکم، وەڵامی نزای نزاکاران دەدەمەوە، هەر کاتێك هاوارو نزام لێ بکەن.

هەروەها یەکێ لە بنچینە گرنگەکانی تەوبەش ئەوەی کە واز لە هاوڕێیە خراپەکانی خۆت بهێنێت و هاوڕێیەتی مرۆڤە چاکەکان بکەیت و لە گەڵیان هاتوچۆی مزگەوت بکەیت و بە کۆمەڵ نوێژ بکەیت.

ئەمەش لە نێرراوی خوا(ﷺ)بەڕاست زانراوە کە فەرموویەتی:

﴿مرۆڤ لەسەر خووڕەوشتی هاوڕێیەتی، با کەسێك سەیر بکات کێ هاوڕێیەتیت دەکات﴾.







**هەمیشە درودو سەلامی خوای لەسەر بێت  فەرمووی:**

**﴿هەڵسان و دانیشتن و هاوڕێیەتی کەسی خراپ وەکو فووکەری کوورەیە، یا ئەوەتا جلوبەرگت دەسووتێنی و یا ئەوەتا بۆنێکی گەنیت لێ بە چنگ دەکەوێت.**

الشیخ ابن باز






# حوکمی گاڵتەکردن بە قسە وەکو کوفر یا جوێندانی ناشیرین

پرسیار: گاڵتەکردن بەقسەی کوفر یا جوێندانی ناشیرینی لە هەندێ کۆمەڵگە موسڵمانەکاندا هەیە، خۆزگە بەڕێزتان تیشکێکتان دەخستە سەر ئەم خووڕەوشتە ناشیرینە کە لەلایەن هەندێ خەڵکی موسڵمانیش وەکو شتێکی باوی لێهاتووەو گەنجی موسڵمانیش هەیە ڕۆژانە بەدەیان جار ئەم شێوە گاڵتەکردن بە قسەو کوفرو جوێندانی ناشیرینی لەدەم دەردێ.

ئومێدەوارم هەڵوێستی داواکارانی زانستی ئایینیمان بۆ روون بکەنەوە کە لەمبارەیەوە چی دەفەرموون؟

وەڵام: بێگومان گاڵتەو سووکایەتی بەیەکدی کردن بەدرۆو جۆرەکانی دیکەی کوفر لەرەوشتە هەرە مەزنەکانی مرۆڤە خراپەکارەکانە، لە نێو کۆمەڵ و لە دانیشتنەکانیشدا ئەم جۆرە خوورەوشت و هەڵس و کەوتە مرۆڤ سووک دەکات و خەڵکی دی بەچاوی کەم سەیری دەکەن و رەفتاری لەگەڵ دەکەن و دەگاتە ئەو رادەیەی ئەوانەی بەم شێوەیە زاریان پیسە لەکۆمەڵ دادەبڕێن.



پێویستیشە هۆشیاربین و خۆمان لەم جۆرە کەسانە بپارێزین. خـوای گەورە ئێمەی لەمە هۆشیار کردووەتەوە بەفەرموودەی:

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾التوبـه:٦٥-٦٦

واتە: سوێند بێ ئەگەر پرسیاریان لـێ بکـەیت، بەراسـتی دەڵـێن، دڵنیابن ئێمە هەر دەمەتەقێ و گاڵتە دەکەین، تۆش بڵێ، ئایا بـەخواو بەڵگەکانی و، پێغەمبەرەکەی، ئێوە گاڵتەو لاقرتیتان دەکرد، بەهانـە مەهێنەوە، بەراستی ئێوە بێ بڕوا بوونەوە، پاش بڕوا هێنانتان.

زۆر کەس لە پێشوویان بەزەیی خوایان لەسەر بێ گوتیان:

ئەمە دەربارەی میللەتێك دابەزیوە لەنێوان خۆیان لەهەڵسوکەوتیان لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) دەیانگوت:

هیچ کۆمەڵێکمان وەکو ئەم کۆمەڵەی خۆمان نەبینیوە کـە هێنـدە حەزی لە سك پڕکردن بێ و هێندە درۆزن و زمان پیس بێ و هێنـدەش لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوە بێ دەسەڵات و ترسنۆك بێ.



خوای تاك و تەنیا كە شایستەی پەرستنە بۆ ئەمانە ئەم ئایەتە پیرۆزەی دابەزاندووە بۆ ناسینو هۆشیاركردنەوەی ئەمانەش پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:

-سزای گەورە بۆ ئەوەی درۆ دەكا تاكو خەڵك پێبكەنێ.. سزای گەورەی لەسەرەو، ئینجا سزای گەورەی لەسەرە. ئەوەی پێویستە لەسەر زانست دۆستانو لەسەر هەموو خوشك و برایان موسڵمان، ئەوەیە كە جگە لە خۆپارێزی خۆیان لەم جۆرە دەمەتەقێیە سووكانە هەمیشە پێویستە ئەوانەی زاریشیان پیسەو كوفری دەكەنو جوێنی ناشیرین دەدەن ئاگادار بكرێنەوە، ئامۆژگاری بكرێن كە ئەم خووڕەوشتە بەمە گەندەڵییەكی گەورە دەخاتە نێو كۆمەڵ و ئەنجامەكەشی زۆر خراپ دەبێت و داڕووخان و داڕمانی دابونەریتی كۆمەڵی موسڵمانی بەدوایەوە دێ، بەمەش كۆمەڵ بەگشتی زیانی پێدەگاتو تاكیش لەهەموو كەس پتر زیانی پێدەگاتو وا لەتاك دەكات كە كۆمەڵ وەكو نامۆ سەیری بكات. لەخوای گەورە داواكارین دڵ و دەروونمان بۆ رێنومایی و ئامۆژگارییە ئایینیەكان والا بكاتەوەو پەروەردەی ئایینی لەدڵ و ویژدانمان جێگیر بكات و خوای گەورە هەر بەخۆی لێمان دەبیستێ و هەر بەخۆیشی وەڵامان دەداتەوە.

الشیخ ابن باز



## سزای ئەوەی گاڵتە بە ئیمانداران دەکات

پرسیار: هەندێ کەس لەوانەی خۆیان بە موسڵمان دەزانن ئەگەر کەسێك ببینن بە سونتەتی پێغەمبەری خۆی خۆی دەنوێنێ وەکو لاسایی کردنەوە لە کورتکردنەوەی جلوبەرگ و، ریش درێژکردنو، دانیشت لە کونجی مزگەوتەکان، سەیر دەکەین ئەمانە بە تۆ دەڵێن ئەمە ئایینی خورافاتە یا قسەیەك دەکەن خوای گەورەو میهرەبان تووڕە دەکەن.

تکایە ئەمانە ئامۆژگاری بکەن، خوا پاداشتان بداتەوە.

وەڵام: پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك ژن بێ یان پیاو کچ بێ یا کوڕ، گەورەبێ یا بچووك ملکەچی سەرجەم فەرمایشتەکانی خوای گەورەو مەزن بێت و پەیڕەوی تەواوی فەرموودەکانی پێغەمبەر محمد(ﷺ)بێت و هەمیشە پەیڕەوو لاسایی گشت هەڵسوکەوتی ژیانی رۆژانەی پێغەمبەریش بکات. ئەوەی خواو پێغەمبەر قەدەغەی کردووە پێویستە لێی دووربکەینەوەو وازی لێبهێنین و ئەوەی ئایینی ئیسلام بۆ ئێمەی داناوە لەسەری بڕۆین و هاوکاری یەکدی بکەینو گوێ نەدەینە قسەی گاڵتەکارو سوکایەتیپێکاران ئەمەش کارپێکردنە بە فەرموودەی خوای گەورە:



﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿١٣٢﴾ ﴾آل-عمران:١٣٢

واتە: وەگوێ ڕایەڵی خوداو پێغەمبەر بن، بێگومـان میهرەبانیتـان لەگەڵ ئەکرێت.

هەروەها خوای گەورە کە هەر تەنیا خـودی خـۆی فەرمانڕەوایـەوە هەڵسووڕێنەری ئەم هەموو گەردوونە پانو بەرینەیە دەفەرمووێت:

﴿ قُلۡ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيۡكُم مَّا حُمِّلۡتُمۡۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُواْۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٥٤﴾ ﴾النور: ٥٤.

واتە: بڵێ فەرمانبەرداری خـواو فەرمانبـەرداری پێغەمبـەر (ﷺ) بن، ئینجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئـەوە ئـەو پێغەمبـەر(ﷺ) تـەنیا بەرپرسیارە لەوەی دراوە بەسەریدا(کە گەیانـدنی پـەیامی خوایـە)، وە ئێوەش بەرپرسن لەوەی دراوە بەسەرتاندا( کە باوەڕ هێنانە).وە ئەگـەر گوێڕایـەڵی پیغەمبـەر(ﷺ) بکـەن، ئـەوە هیدایـەت وەردەگـرن، وە پێغەمبەر هیچی لەسەر نییە، بێجگـە لـە گەیانـدن و ڕوونو ئاشـکرا کردنی پەیامی خوا.

دیسان خوای گەورە لە سوورەتی- النساء - دا دەفەرمووێت:



﴿ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ
جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ
وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ
وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ
مُّهِينٌ ﴿١٤﴾ ﴾ النساء: ١٣-١٤

واتە: ئەو (یاسایانە) سنوورەکانی خودان، هەر کەسێك گوێ ڕایەڵی، خواو پێغەمبەرەکەی بێت، خوا دەیخاتە ناو بەهەشتەکانەوە، کە ڕووبارەکان دێن و دەچن بەژێریاندا، تیایدا دەمێننەوە بەهەمیشەیی، وە ئەوەیە سەرکەوتنی زۆر گەورە، هەر کەسێکیش سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی بکاتو، سنوورەکانی (خوا) ببەزێنێت، دەیخاتە ئاگرێکەوە، هەمیشە دەمێنێتەوە تیایدا، و سزایەکی رسواکەری بۆ هەیە.

هەروەها زۆر ئایەتی دیکەش بەم مانایەوە لە قورئانی پیرۆزدا هەیە.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت:

﴿هەموو نەتەوەی من دەچنە بەهەشتەوە تەنیا مەگەر ئەوەی نەیەوێ. گوتیان ئەی نێرراوی خودا، کێ هەیە نەیەوێ؟ فەرمووی:



ئەوەی گوێڕایەڵی من بێ دەچێتە بەهەشتەوەو ئەوەی کە لە منیش یاخی بێ بەمانای رۆح زل و لووت بەرزو بەفیزەو نایەوێت بچێتە بەهەشتەوە﴾. رواه بخاري في صحيحه.

لە گوێ ڕایەڵی بۆ خواو پێغەمبەرەکەی: نوێژەکان فەرامۆش نەکەیت و ژن و پیاو پێویستە لە کاتی خۆیان نوێژەکان بکەنو پیاوەکان پێویستە لەسەریان کە نوێژەکان لەمزگەوت لەگەڵ موسڵمانەکاندا بکەن هەورەها لە گوێڕایەڵی پێغەمبەرو خواپەرستی ئەوەیە کە زەکات بدات و مانگی رەمەزان بە رۆژوو بێت و ئەگەر باری گوزەرانی باش بوو (حەج)ی ماڵی خوا بکاتو لەگەڵ دایک وباوکی خۆی چاك بێت و سەردانی خزمان بکاتو دەمی خۆی لەو گۆشتانە بگرێ کە خوای گەورە قەدەغەو حەرامی کردووە، ئامۆژگاری خەڵکی بەچاکە بکاو، چاو لە شتی نارەوا نەپۆشێ و هاوکاری لەسەر چاکەو خواپەرستی بکاو، فرمان بەچاکە بکاو نەهی لە خراپەش بکا.

لەوەی پێویستە لەسەر پیاو کە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بێ: سمێڵی خۆی بتاشێ و ریشی بەرداتەوە تاکو زۆر ببێ و هۆشیار بێ لەوەی جل و بەرگی هێندە شۆڕ نەبێ بگاتە ژێر هەردوو پاش پانەکان.








چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:

﴿سمێڵتان بتاشن و ریشتان بەردەنەوە تاکو لەگەڵ خوانەناسەکان جیاواز بن﴾ متفق على صحته.

هەروەها درودو سەلامی خوای لەسەر بێ فەرمووی:

﴿ئەوەی قۆپچەی لە خوارەوەی هەردوو پاشپانیدا هەبێ جێی نێو ئاگری دۆزەخە﴾ أخرجه الامام البخاري في صحيحه.

قۆپچەکانیش قۆپچەکانی هەموو ئەو جل و بەرگانەی وەکو شەرواڵ و کراسە سپییە درێژەکان و عەباو -پەشتەماڵەکان دەگرێتەوە (بۆ نموونە وەکو ئەو پشتەماڵانەی خەڵکی یەمەن کە لە جیاتی جل و بەرگی ئاسایی لە لەشی خۆیان دەپێچن).

درودو سەلامی خوای لەسەر بێ فەرمووی:

﴿سێ کەس لە رۆژی ئاخیرەت خوا قسەیان لەگەڵ ناکات و سەیریان ناکات و لە گوناهەکانیان پاکیان ناکاتەوە و سزایەکی بەئازاریان لەسەر دەبێ: ئەوەی دەمی بەجوێن دەکاتەوەو، ئەوەی پیاوەتی و خێر دەکاو منەتکارەو، ئەوەی بازاڕی کەلوپەلی خۆی بە سوێندی بەدرۆ گەرم دەکات﴾. أخرجه الامام مسلم في صحيحه.

خوا خۆشەویست و دۆست و سەرخەرو پشتیوانی خواناسانە.

الشيخ ابن باز









## سوودەکانی تاقیکردنەوەی بڕوادار

پرسیار: لەبەرچی خوای گەورە باری ئیمانداران ئەوانەی پتر دەیپەرستن بەدەردو بەڵایەکانی دنیا گران دەکات و لەکاتێکدا هەڵگەڕاوەو یاخیبووەکانیش لەنێو چێژی خۆشی ژیان مەلە دەکەن.

وەڵام: ئەم پرسیارە بە دوو شێوە وەڵام دەدرێتەوە:

یەکێکیان: تەگەرەو دووەمیان : تاقیکردنەوە

ئینجا ئەگەرچی مرۆڤی ئیماندار لەژیانی رۆژانەدا کە تووشی تەگەرەو رێ و شوێنی تەنگەبەر دێ، ئەمەش خوای گەورە پێویستی بەکەس نییەو هەر بەتەنیا ئاسمانو زەویو ئەوەی لەنێوانیاندا هەیە هەمووی راگرتووەو سەرپەرشتی هەر جوولەیەکی ئەم گەردوونە سەیرو پان و بەرینە ددکات هەر بەخۆی دەزانێت و هەر بەخۆیشی لە هەموو شت ئاگادارە.

ئەمەش نیشانەی نەزانی و نەفامی پرسیارکارە، چونکە زانین و شارەزایی خوای گەورە لەمە مەزنترە کە مێشکی ئێمە لێی تێبگا و بگاتە ئاستێك بتوانین هەموو شتێك لێکبدەینەوە.

ئێمەی بەندە بەرانبەر داهێنانەکانی خوای مەزن تەنیا شایستەی کڕنۆش بردنین، بەرانبەر ئەو بەخشینەی بە ئێمەی داوە هەر دەبێت



نوژدەی بۆ بەرین، هەر تەنیا خودی خۆی فەرمانڕەوایەو هەڵسوڕێنەری ئەم هەموو زەمەنەیە. خوای گەورە دەفەرموویت:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥ ﴾ الاسراو: ٨٥.

واتە: وە ئەی موحەممەد(ﷺ) پرسیارت لێدەکەن لە بارەی ڕۆحەوە( کەچییە)، بڵێ ڕۆح لە کارو فرمانی تایبەت بە پەروەردگارمە، وە ئێوە تەنیا کەمێك لە زانیاریتان پێ بەخشراوە.

ئەم ڕۆحەش کە لەنێوان هەردوو دەفەی سنگمانە هەر بەخۆیشی ماددەی ژیانمانە ئێمە هیچی لێ نازانین و نە ئامێری تێڕوانینو نە پیتۆڵەکانو نە نووسەر و ئەدیبو زانایەکان نەیانتوانیوە سەر لەخودی دەربکەن وپێناسەیەکی تەواوی بکەن. ئەگەر ئەم ڕۆحە نزیکترین بوونەوەر بێ بۆ ئێمە کە نازانین چییە تەنیا ئەوە نەبێ کە لە قورئان و پێڕەودا هاتووە ئیدی چۆن ئێمە لە بوونی ئەمە تێبگەین و بزانین لەدوای ئەمەوە چی هەیە.

خوای گەورەو مهیرەبان هەر بەخۆی ڕاگرترەو هەر بەخۆی مەزنترەو هەر بەخۆیشی زاناترە. ئێمە پێویستە لەسەرمان تەواو ملکەچی داهێنانەکانی بین، ئێمە تەواو گیرۆدەی ئەم گەردوونەبین و پابەندی قەزاو قەدەرین، چونکە بەدرێژایی مێژوو مرۆڤ بەرانبەر ئامانجەکانی



داهێنانی گەردوون دەستەپاچە وەستاوەو مێشکی مرۆڤ بۆ ئەم مەبەستە سنووردارەو ناگاتە ئەو ئاستەی لێکدانەوە لە حیکمەتی خوای گەورەدا بکات. وەلامەکەش بۆ ئەمە بۆ ئەم لایەنەی پرسیارەکە دەلێن:

خوا راگرترەو هەر بەخۆی مەزنترەو هەر بەخۆشی زاناترە.

بەلام ئەوەی دووەم: پرسیاری تاقیکردنەوە، ئێمەش بەم پرسیارکارە دەلێین:

مرۆڤی خواناس و ئیماندار تووشی دەردو بەلای دنیا دەبێ و خوا تووشی دەکات بەوەی ئازاری بدات، ئەمەش دوو سوودی مەزنی هەیە:

سوودی یەکەمین: تاقیکردنەوەی ئەم پیاوە لە بیروباوەڕی ئایا بڕوای راستە یا شلۆق و لەرزۆکە؟

خواناسی راستەقینە ئەوەی بڕوای تەواوی هەیە بەرانبەر قەزاو قەدەری خوای گەورە ئارام دەگرێ، بەمەش پاداشتی بۆ دەنوسرێ و ئەو کاتەش دەردو بەلایەکەی لەسەر سووک دەکرێتەوە.

گوتراوە هەندێ لە ئافرەتە خواناسەکان تووشی پەنجە بڕین یا بڕین بووەو، بەلام هەستی بە ئازار نەکردووەو خۆی نەشێواندووە.

دەربارەی ئەمەش پێی گواتراوە:








ئـــەویش گووتوویـــەتی: خۆشـــی پاداشـــتی ئـــازاری زامەکـــەی لەبیربردمەوە.

ئەوەی خواناسی تەواوبێ لەلای خوای گەورە پاداشـتی بـۆ حـسێب دەکرێ و بەمەش ملکەچی قەزاو قەدەر دەبێ، ئەمەش سوودەکەیەتی.

کەچی سوودی دووەم ئەوەیە کە خـوای گـەورەو مـەزن زۆر بەسـەر ئارامگران هەڵدەداو سوپاس و ستایشیان دەکات، ئاگاداریان دەکاتەوە کە خۆی لەگەڵیانەوە دەیانبینێت و پاداشتیان دەداتەوە پاداشتێك کـە بەحسێب نەبێت.

ئارام گرتنیش پلەیەکی بەرزە کەس بە چنگی ناکەوێت تەنیا ئەوانە نەبێ کە لەسەر دەردو نەخۆشی و بەڵاو قەزاو قـەدەر چـاك ئارامیـان گرتووەو ڕێگای راستی پێڕەوی خواو پێغەمبەریان بەرنـەداوەو، ئەگـەر ئارمیشی گرت ئەم پلە بەرزە وەردەگرێ کە ئەم پاداشتەی تێدایە.

بەمەش خوای گەورە کە خواناس و ئیمانـداران تووشـی نەخۆشـیو بەڵای دنیا دەکاتەوە کە پێیەوە دەتلێنەوەو ئازار دەکێشن هەر لەبـەر ئەمەیە کە پلەی ئارامگران وەرگرن.

لەبەر ئەمە پێغەمبەر (ﷺ) مەزنترین کەس بووە لە بڕواو پەرستن و لەهەموو کەسیش پتر لەخوا ترساوەو هەموو ساردی و گەرمییـەکی دنیای بینیوەو لـەو سـەردەمەی کـە موسـڵمانەکان بـێ چـەك بوونـە



هەمیشە ئارامی گرتووە ئەم هەموو شتە لە پێناو گەیشتن بە پلەی ئارامگرتن بووە دروودو سەلامی خوای لەسەر بێ ئارامگرترین ئارامگران بووە.

لەمەدا دانایيت بۆ بەدیار دەکەوێ کە خوای گەورە، ئەو خوایەی تاك و تەنیایە، راوەستاوەو گۆڕانی نییە، هەر بەخۆی بەندەی خۆی ئەوانەی خواناسی راستەقینەن، ئەوانەی تەواو لەخوا دەترسن، ئەوانەی بڕوایان هەرگیز بەخوای تاك و تەنیا نالەقێ. تووشی دەردو بەلای دنیایان دەکاتەوە هەموو دەمێك دەیانخاتە سەر رۆخی خەرەندی قەزاو قەدەر بەلام کە هەر بەخۆی تەندروستیو ماڵی دنیا دەداتە لووت بەرزو منەتکارو یاخیبوون و بەدڕەوشت و زمان پیس و بێ ئەمەك و ستەمکارو بکوژان، ئەمە هەمیشە بۆ ئەوەیە کە خوای گەورە بەمیهرەبانیو بەزەیی خۆی ماوەیان پێدەدا تاکو لە کاری ناڕەوای خۆیان پتر بەردەوام بن و ئەمانە مزگێنیان دراوەتێ کە لە رۆژی زیندووبوونەوە لێپرسینەوەی گرانیان لەگەڵ دەکرێ و چەند جار سزا دەدرێن و بێ گومان جێگەشیان نێو ئاگرە.

پێغەمبەر دروودو سەلامی خوای لەسەر بێ بە فەرموودەیەك دڵنیای کردووینەتەوە ڕێگای ڕاستی ژیانی یەکەم و ژیانی دووەمی بۆ روون کردووینەوە کە دەفەرمووێت:








دنیا زیندانی خواناسانەو، بەهەشتی کافرانە.

ئەوانەی لە خواو پێغەمبەر (ﷺ) یاخی بوونەو پێڕەوی ئایین فەرامۆش دەکەن و گوێ نادەنە ڕێنومایی‌و ئامۆژگارییەکان لە دنیا شەو و ڕۆژ بازرگانی ساختە دەکەن و کەلوپەلەکانیان بەسوێندی بەدرۆ دەفرۆشن و هەموو دەمێك مێشکیان لەلای پارە کۆکردنەوەیەو هیچ ئاگایان لە برای موسڵمانی خۆیان نییەو لە شوێنە تایبەتییەکان شەوی سوور بەسەر دەبەن ئەمانە هەر بەخۆیان سورِ دەزانن و لەمەش دڵنیان کە لە ڕۆژی ئاخیرەت سزایەکی بە ئازار دەدرێن و لێی دەرباز نابن.

خوای گەورەو مەزن، لە تۆڵە سەندنەوە پەلە ناکات، لەسەر ئەم هەموو بێ باوەڕییەی بەندەی خۆی پەلە ناکات، لەسەر ئەو درۆو بەدڕەوشتیانەی ڕۆژانە کە بەندەی خۆی دەیکات پەلە ناکات، لەسەر ئەوەی هاوبەش بۆ خوای گەورە دەدۆزنەوە پەلە ناکات. ژیانی خۆی بەگشتی، ژیانی ڕۆژانەی خۆی هەمووی بەماڵی دزی‌و قوڵبڕی بەسەر دەبات، لەمەش پەلە ناکات، بەڵکو مۆڵەتێکی دوورو درێژ دەداتە بەندەی خۆی تاکو خوای گەورەی خۆی بەڕاست و دروست بناسێت، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز نابێت خوای گەورە فەرامۆش بکرێت کە بە توندی سزای بەندەی خۆی دەدات و لەگەڵ ئەمەشدا زۆر میهرەبانو بەسۆزە.







خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ فِى حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنْيَا وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ (٢٠) ﴾ الاحقاف: ٢٠

واتە (بیریان بخەرەوە) ئەو رۆژەی، ئەوانەی کە بێ باوەڕن بەرانبەر دۆزەخ رادەگیرێن، (پێیان دەگوترێت) هەرچی خۆشیتان بوو بەسەرتان برد، لە ژیانی دنیاتانداو، بەهرەو لەزەتتان لێ برد، بۆیە ئەمڕۆ تۆڵەتان لێدەسەنرێ، بە سزایەکی رسواکەر، لەبەر ئەوەی ئێوە، بەناڕەوا خۆتان بەزل دەزانی لە زەویدا، وە لەبەر ئەوەی لە فرمانی خوا دەردەچوون.

ئاکامی ئەمەش، ئەم دنیایە بۆ کافرانە کە خوای گەورە بەشێنەیی بە پێشیان دەخات و بەزریان دەکاتەوە.

دانایی لە فەرموودەی پێغەمبەرمان محمد(ﷺ) کە دەفەرمووێت:







ئەم دنیایە بۆ خواناس و ئیماندارو مرۆڤ چاکان زیندانەو بۆ ئەوانەی هەموو دەمێك لە ژیاندا چەوتن و بە ناحەق دەجوولێنەوە ژیانی دنیا بۆ ئەمانە بەهەشتە.

ئەوانەی لە دنیا تەندروستیان باشەو بۆ سووکە نەخۆشییەك پارەی تۆکمەی بە ساختەو سوێندی بەدرۆ کراوە لە خۆیان سەرف دەکەن و لە خۆشی و شادی دنیا خواو پێغەمبەریان(ﷺ) لەبیر نییە ئەمانە کاتێ دەگەنە بەر قاپی خوای گەورد، شەرمەزارو ڕوو ڕەشن، سزای توند دەدرێن، سزایەك لەسەریان بەردەوام دەبێ و ئەو خۆشی و بەختەوەرییەیان لەگەڵ مردن کۆتایی دێت و هەموو چەشنە ئازارێکیان لەسەر کۆدەکرێتەوە.

ئەمەش سوودی سێیەمە دەکرێ بیخەینە سەر هەردوو سوودەکانی پێشتر کە لەو کاتەی خوای گەورە بەندەی خواناسی خۆی بە ئەرکی گرانی ڕۆژانەو نەخۆشی کوشندەی دوورخایەنو هەمیشە تووشی بەلای گەورەی دنیای دەکاتەوەو ژیانی لێ تاڵ دەکاو تووشی کارەساتی دڵتەزێنی لەناکاوی دەکاتەوە.. بەمانە خواناس دەگوێزرێتەوە لە ژیانی ئەم دنیایە پڕ چەرمەسەرییە بۆ ژیانێکی نوێ،



زیندووبوونەوەیەکی نوێ کە تێیدا خۆشی دەبینێ و بەختەوەری هەمیشەیی بەدەست دێنێ بێگومان ئەم خۆشیو بەختەوەرییە هەمیشەییە پاداشتی ئەم ئێش و ئازارانە دەبێ کە لە ژیانی یەکەم خۆشی و شادی بەچاوی خۆی نەبینیوەو لە بڕوای خۆی لاینەداوەو دەردو بەڵاو کارەساتی دنیاش دەستی لە بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام شل نەکردووە.

-الشیخ إبن عثیمین-







## بڕوا بوون بەخود

پرسیار: حوکمی ئەم قسەیە چییە: "فولان بڕوای بەخۆیەتی" یان "فولانە کەس بڕوای بەخوی هەیە" ئایا ئەمە لەگەڵ ئەم دوعایە ڕێکدەکەوێ کە دەڵێ "ئەی خودایە بۆ چاونووقانێکیش بێ هێزو شەکەتم نەکەیت"

وەڵام: ئەمە هێندە گوناه نییە، چونکە مەبەستی بێژەر کە دەڵێ:

فولان بڕوای بەخۆی هەیەو، لەمەش دڵنیایە، مانای ئەوەیە لەم شتە دڵنیایەو، مسۆگەر دەزانێ کە شتەکە هەیەو لەوانەش بە چاوی خۆی بینیویەتی یا کەسێکی دیکەی جێی بڕوا لێی دڵنیایە و یا بە چاوی خۆی بینیویەتی. بێگومان مرۆڤ کە هەست بە هەر شتێك دەکات ئەم شتە بەرانبەر ئەو ڕێژەییەو جێی مەزندەیە، هەندێ جاریش گومانو دڵەڕاوکێیەو هەندێ جاریش دوو دڵ و هەر جارەی دڵی بەلایەکەوەیە ئەگەر گوتی: من لەمە دڵنیام، یا من لەخودی خۆم دڵنیام، یا فولان لەخۆی دڵنیایە، یا لەوەی دەیلێ دڵنیایە، مەبەست لەمە: ئەو لەمە دڵنیایەو گومانی نییە.

ئەمەش گوناهی تێدا نییەو، لەگەڵ ئەم دوعایەش:



"ئەی خودایە بۆ چاونووقانێکیش بێ هێزو شەکەتم نەکەیت"

چونکە مرۆڤ لەخودی خۆی دڵنیایە کە خوای گەورە دەپەرستێ و لەوانەش خوای میهرەبان زانستێك یا توانایەك یا شتێکی لەم بابەتانەی پێ بەخشیوە.

الشیخ ابن عثیمین








## خوای گەورە ئەوەی مەبەستی بێ ڕێگای ڕزگاری پێ نیشان دەدات

پرسیار: بەو کەسە چ بڵێین کە داوای لێبکەین تەوبەی ئێجگاری بکات و بەرەو خواپەرستی بگەڕێتەوە، لەکاتێکدا ئەویش پێمان دەڵێت: خوا هێشتا ڕێگای ڕووناکی بۆ نەنووسیوم، یا یەکێکی دی دەڵێت:

ئەوەی خوا مەبەستی بێ ڕابەری دەکات و دەیخاتە سەر ڕێگای ڕاست.

وەڵام: ئەوەی یەکەم کە دەڵێ: خوا هێشتا ڕێگای ڕاستی بۆ نەنووسیوم.

زۆر بەئاسانی دەڵێین: لە زانستی شتی نادیارەوە زانیوتە لەلایەن خواوە پەیمانت بەستووە؟

ئەگەر گوتی: بەڵێ: ئێمەش دەڵێین: کەواتە کوفرت کرد، چونکە تۆ خۆت وا بەدیار خست کە لەناسینی شتی نادیارەوە دەزانیت.

ئەگەر گوتیشی، نەخێر، دەڵێین: بردووتەوە، ئەگەر تۆ هێشتا ڕێگای خواپەرستی ناناسیت، خوای گەورە هەمیشە مەبەستیەتی ڕێگای ڕاست و دروست بە بەندەی خۆی نیشان بدات، خوای گەورە لەهیچ شتێك ڕێگای لە تۆ نەگرتووە، ئەگەر خۆت لە ڕۆشنبیری







ئایینی پڕ زانست بکەیت، لە تاریك و نەفامی خۆت رزگار بکەیت، ئەگەر ئارەزوو بکەیت مێژووی ئایینی ئیسلام بزانیت و ڕێبازی پێغەمبەران بزانیت ئەوا خوای گەورەش ئاسانکاریت بۆ دەکات و هەمیشە خوای گەورە حەز ناکات بەندەی خۆی لە تاریکی نەزانی بمینێتەوە:

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦﴾ ﴾ النساء: ٢٦

واتە: خوا دەیەوێت، بۆتان روون بکاتەوە، وە ڕێنوومایيتان بکات، بۆ ڕێ و شوێنی ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون (لەخواناسان)، و لێتان خۆش ببێت، وە خوا زانای کاردروستە.

لەخوای گەورە داوای تەوبە بکە، خوای گەورەو میهرەبان، ئەو خوایەی کە زۆر نەرمەو لێبووردەیە، زۆر بەسۆزو بەخشندەیە بەتەوبەی تۆ زۆر دڵخۆش دەبێت. تەوبەیەك لە پیاوێك لە ڕێگاوبانێکی بیابان وشتری خۆی گووم کردبێ خۆراك و خواردنەوەی لەنێو باردا بێ و تەواویش لێی بێ ئومێد بێ، پیاوەکە لە ژێر سێبەری درەختێکی گەورە نووست چاوەڕوانی مردنی کرد، کاتێ بە







ئاگا دێتەوە سەیر دەکات جڵەوی وشترەکەی بەدرەختەکەوە گیر بووە، ئەویش جڵەوی وشترەکەی خۆی دەگرێت لەتاو خۆشی خۆی گوتی ئەی خودایە هەر تۆ بەندەی منی و من پەروەردگاری تۆم، لەمەشدا لەتاو خۆشی دۆزینەوەی وشترەکەی خۆی هەڵەیەکی کرد، بەمەش دەیوست بڵێت: ئەی خودایە هەر تۆ پەروەردگاری منی و من بەندەی تۆم.

بەڵام ئەوەی دووەم کە دەڵێ: ئەوەی خوا مەبەستی بێ رابەری دەکات و دەیخاتە سەر رێگای راست. ئێنجا ئەگەر ئەوەی خوای میهرەبان ئارەزووی لێبێ و حەزی لێبکات رێبەری بکات و رێگای راستی نیشان بدات کەواتە ئەمە لەسەر تۆ دەبێتە شتێکی -پێویست- رێگای خوا بگرەو خوا بناسە تاکو خوای گەورەش لەگەڵ تۆ میهرەبان و بەسۆز بێت ئاسانکاریت بۆ بکاتو لە ژیانی رۆژانە پاڵپشتت بێ بارگرانی گوزەرانی ژیانت لەسەر ئاسان بکات و دەرگای بەخشینی خۆیت بۆ والا بکاتەوە، خوای گەورە لەگەڵ بەندەی خۆی هێندە نەرم و لێبووردەو بەسۆزو بەخشندەیە هیچ ماوەیەك هیچ پاساوێك بۆ بەندەی خۆی ناهێڵێتەوە کە لەرووی خوای داهێنەر بووەستێ لە پەرستنی یاخی بێ و لەدنیایەك کە زیندووبوونەوەو لێپرسینەوەی بەدواوەیە بەنەزانی و کوێری بمینێتەوە.







خوای گەورەش دەفەرموێت:

﴿ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشۡرَكۡنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ حَتَّىٰ ذَاقُواْ بَأۡسَنَاۗ قُلۡ هَلۡ عِندَكُم مِّنۡ عِلۡمٖ فَتُخۡرِجُوهُ لَنَآۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَخۡرُصُونَ ١٤٨ ﴾ الانعام:١٤٨

واتە: ئەوانەی کە هاوبەشیان بۆ خوا دانابوو لەمەودوا دەڵێن: ئەگەر خوا بیویستایە ئێمەو باوو باپیرانمان هاوبەشمان بۆ (خوا) دانەدەنا، وە هیچ شتێکمان حەرام نەدەکرد، هەر بەو شێوەیە ئەوانەی پێش ئەمانیش درۆیان کرد، هەتا سزاو تۆڵەی ئێمەیان چەشت، ئەی موحەمەد (ﷺ) بڵێ ئایا هیچ زانیارییەکتان لایە، تا دەری بخەن بۆمان و دەری ببڕن، ئێوە شوێنی هیچ شتێك ناکەون بێجگە لە گومان، وە ئێوە هەر لەخۆتانەوە بەگۆترە شت دەڵێن.

الشیخ ابن عثیمین



## لەگەڵ خوا لە تەوبەی ئێجگاری ڕاستگۆبە

پرسیار: من گەنجێکم دوای ئەوەی شەیتان شتی خراپ دەخاتە دڵم دەست بە کردەوەی خراپ دەکەم، ئینجا هەموو جارێك کە کردەوە خراپەکانیش دەکەم تەوبەیەکی تەواویش دەکەم و دووبارە روو لە خوای گەورە دەکەمەوە بەڵام دیسان ناتوانم لە تەوبەکە بەردەوام بم و سەر لەنوێ روو لە کردەوەی خراپ دەکەمەوە، لەمەدا ئامۆژگاریو رێنمایی تۆ چییە تاکو پێڕەوی بکەم؟

وەڵام: ئامۆژگاری من ئەوەیە کەلە تەوبەکردن لەگەڵ خوای گەورە ڕاستگۆبیت بەمەش خوای بەخشندەو میهرەبان دەتخاتە سەر رێگای راست و لەخواپەرستی بەردەوام دەبیت.

هەرچەند تاوان بکەیت و لەخوای پاڕایتەوەو داوای لێبوردنت لێکرد تەوبەت کردو تەوبەیەکی ئێجگاری بەبێ مەبەستێکی کاتیو بڕیارت دا کە لە ئایندە نەگەڕێیتەوە سەر ئەم کردەوە خراپانە خوای گەورەو میهرەبان بە تەوبەکردنی بەندەی خۆی قایلەو لەهەموو گوناهەکانی خۆش دەبێت، برای موسڵمان پێویستە ئەمەش بە مسۆگەری بزانیت کە لە تەوبەکردن مەبەست ئەوە نییە دوای هەزارو یەك کردەوەی بەدو بەدکاری، درۆو تەڵەکە بازی و دزی و قۆڵبڕی.. تالآنکاری... کوشتن و بڕین... بوختانکاری.. ئینجا بەبڕوایەکی لاواز تەوبە بکرێت و دوای







ماوەیەك دووبارە بگەڕێتەوە سەر خووڕەوشتەکەی جاران و دەست بە تالآنکاری ماڵ و سامانی موسڵمانان بکاتەوە.

بەڵام لە هەموو حاڵەتەکانیشدا خوای میهرەبان کە لە هەموو سۆزداران سۆزدارترەو لەهەموو بەزەییداران بەزەییدارترە بە تەوبەی تێجگاری لەبەندەی خۆی خۆش دەبێت سەرجەم کردەوە خراپەکانی لەسەر دەسڕێتەوە.

پێغەمبەر درودو سەلامی خوای لەسەر بێ فەرمووی:

﴿ئەگەر ستەم و تاوان نەکەن خوای مەزن ئێوە دەباتەوەو میللەتێکی دیکە دێنێ ستەم و تاوان دەکەن و لەخوا دەپاڕێنەوە خوای گەورەش لێیان دەبوورێت).

سوپاس و ستایش بۆ خوا ئەمە چاکەیەکە.. چاکەیەکی گەورە.

تۆش هۆشیاربەوە بەتەنگ بڕیاری خۆتەوە بە کە تەوبەکەت تەوبەیەکی ئێجگاری بێت و، ئاگادار بە نەگەڕێیتەوە سەر دۆخی جاران و شەیتان هەڵتنەخەڵەتێنێ و، بەڵام ئەگەر دیسان خۆت پێ نەگیراو تەوبەت کرد خوای گەورە کە سزای ئازاردەری هەیە ماڵت وێران دەکاو دەتفەوتێنێ.

الشيخ إبن عثيمين







## مەترسی بڕیاردان

پرسیار: جەنابی شێخ، لەلایەن هەندێ گەنجانی پابەند بە ڕێبازی ئاپین دیاردەیەك بەدیار کەوتووە دەمانەوێ تێیدا ئەمە یەکلا بکەیتەوە ئەویش ئەوەیە کە هەندێکیان دەڵێن: هەر نووسەرێك لە نووسینەکەی شتێکی نوێخوازی تێدابێت یا ئەوەتا باس لە شتێکی نوێ بکات یا ئەوەتا سەرنج و تێبینی لە بیروبڕوایەکەیدا هەبێت ئەم نووسینەی بەرپەرچ دەدرێتەوەو ناشبێ بەزەیی پێ بکرێتەوەو هەروەها لەلایەن هەندێکیانەوە لەسەر هەڵەیەك نیمچە یاخی بوونی تێدا بێ کە کەمتەرخەمی لەلایەن کەسەوە بنوێنێ سەیر دەکەیت ئەمانە ئەو کەسە بە بێ باوەڕو کافر لەقەڵەم دەدەن تکاتان لێ دەکەم رووی ڕاستی لەمە روون بکەنەوە خوا ئاگادارتان بێ و لەدەردو بەڵای دنیا بتانپارێزی.

وەڵام: ئێستا پرسیارەکە لەدوو کەرت پێکدێت:

کەرتی یەکەم: ئەگەر یەکێك لەزانایان بەنوێخوازی قسەی کرد یا لە مەسەلەیەك لەمەسەلەکان رێبازی میللەتێکی نوێخوازی گرتەبەر ئەوە لەومیللەتە دەژمێردرێت و بە کەسانێکی ئەو میللەتە دادەنرێت؟



وەڵام: نەخێر، لەو میللەتە ناژمێردرێت بە کەسی ئەو میللەتەش دانراندرێت و ئەگەر لە مەسەلەیەك لە مەسەلەکان لەگەڵ سەرجەم میللەتەکە قایل بوو ئەو کاتە ناکرێ بە شێوەی ڕەها لەسەر ئەو میللەتەی حسێب بکەیت بەیەك چاو وەك خەڵکی سادەی میللەتەکە سەیری بکەیت و هەڵوێستی لێوەرگریت بۆیە بۆ نموونە ئێمە ئێستا بیرو لێکدانەوەکانی ئیمام (احمد بن حنبل) خوا لێی ڕازی بێت پێڕەو دەکەین، بەڵام ئەگەر لەسەر مەسەلەیەك لە مەسەلەکان بە بیرو لێکدانەوەی (الشافعی)مان کرد ئایا ئەمە مانای ئەوەیە بۆ نموونە ئێمە بووینەتە شافیعی؟ یا بە لێکدانەوەی مالیك بووینەتە مالیکی؟ یا بە لێکدانەوەی حەنیفە بووینەتە حەنەفی؟ هەروەها ئەوان، ئەی ئەگەر ئەوان لەمەسەلەیەك بە گوێرەی لێکدانەوەی ئیمام ئەحمەد بکەن دەبێ بڵێین ئەوان بووینەتە حەنبەلی؟

نەخێر... ئەگەر بینیمان یەکێك لە زانایە شارەزایە ناسراوەکان شتێکی لە بڕوایان لە خەڵکی نوێخواز پەسەند کرد یا وەرگرت و ئامۆژگاری خەڵکی دی پێ کرد ڕاست نییە و ناکرێ بڵێین ئەمە لەوانەو یا چووەتە سەر ڕێباز یا ڕێ و شوێنی ئەوان، دەڵێین: ئەوانە لەوەی لێیان بەدی دەکەین تەنیا ئامۆژگارییە بۆ ئەوەی ئەهلی کیتابی خواو ڕێبازی نێردراو (ﷺ)و بەندەکانی خوای مەزن. ئەگەر لەم



مەسەلەیە هەڵەیان کرد، ئەم هەڵەیە لەبۆچوون و لێکدانـەوە هـاتووە، هەر کەسێ لەم نەتەوەیە بۆچوون و لێکدانـەوەی هـەبێ دوو پاداشـتی هەیەو، ئەوەی تێیدا هەڵەش بکا یەك پاداشتی هەیە.

ئەوەی هەموو ڕاستییەکیش، بەرانبەر بەو کەسەی ڕاستی دەڵێ بە وشەی هەڵەش نەبوو. چونکە هەندێ کەس ئەگـەر کەسـێ پێـچەوانەی بۆچوونو لێکدانەوەی کرد گوتی: ئەمە لەسەر هەڵەیـەو ناچـاری کـرد بۆچـوون و لێکدانەوەکـەی ئـەو پێـڕەو بکـات ئەمـە مەترسـییەکی گەورەیەو تووشی لێژییەکی هێندە سـەخت دەبینـەوە مەگـەر خـوای گەورە ڕزگارمان بکات ئەی خوایە هەر تۆ گـەورەیتو لەهـەموو شـت ئاگاداریت.

کەرتی دووەم: هەمیشە ئەمەش ئەوەی لەسەر هۆیـەك یـا لاسـاری کردنێك، یا یاخوبوونێك، یا مانگرتنێك، یا پێچەوانەیەك کەسانی دی بەکافرو بێ باوەڕ بزانـێ، ئەگـەر ئـەم دەربڕینـەمان بـۆ ئـەم شـێوازە دەرچوونانە بێ لە پێڕەوی ئایین، ئینجا ئەگەر ئەم بەکافر دانانەش خوا نەخواستە ببێتە پێڕەوو پرۆگرام و ڕێبازێك بێ میللەتێکی گەورە باوەڕ پێ بهێنن ئەمە خۆی لەخۆیدا باوەڕو بڕوایەکە خراپتر لە باوەڕو بـڕوای دەرچووان (الخوارج) چونکە بەگوێرەی بڕوای خەواریجەکان لەسـەر هـەر لاساریو یاخی بوونو مانگرتنو پێچەوانەیەك شتی گەورەیان دەکـرد،



ئێنجا ئێستا ئەگەر ببینیت کەسێك لەسەر پێچەوانەیەك موسڵمانان بە کافرو بێ باوەڕ لەقەڵەم دەدات ئەمە بێ گومان نەزانەو لـەڕێی ڕاسـت لایداوەو بە پێچەوانەی قورئـان و پێـڕەو دەڕوات کـە لـە ڕاستیـشدا ئەمانە پتر لە باوەڕو بڕوای خەوارج تێدەپەڕێنن کە علـی کـوڕی ئـەبی تالیب شمشێری لە ڕوویان بەرزکردەوە.

موسـڵمانەکان لـە بـەکافردانانی موسـڵمانانی دی جیـاوازبوون تێیاندا هەبوو موسـڵمانانی دی لەسـەر هـەر هەڵەیـەك بـەکافرو بـێ باوەڕی دادەنا، تێشیاندا هەبوو بـە بەدڕەویـشتی و زیناکـەری پیـسی لەقەڵەم دەدا ئەوەی سزای گەورەبوو سزایان دەدا.

خوای گەورە دەفەرموویێت:

﴿ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ٣١ ﴾ النساء: ٣١

واتـە: ئەگـەر دووربکەونـەوە لـەو تاوانـە گەورانـەی کـە لێتـان قەدەغەکراوە، ئەوە تاوانە بچووکەکانتان بـۆ دەپۆشـین، وە دەتانخەینـە شوێنێکی چاك و ڕێزدارەوە.



مـرۆڤیش کـاتێ لـه گوناهـه گـه‌وره‌کان دووز ده‌که‌وێتـه‌وه خـوای میهره‌بان له گوناهه بچووکه‌کانی خۆش ده‌بێـت و چـاوی لێده‌پۆشـێت مه‌گه‌ر له‌سه‌ر گوناهه بچووکه‌کان مکورو به‌رده‌وام نه‌بێت. به‌ڵام ئه‌گه‌ر هه‌میشه له‌سه‌ر گوناهه بچووکه‌کان به‌رده‌وام بوو، زانایان گوتیان:

مکوڕ بوون و رشت بـوون له‌سـه‌ر گوناهـه بـچووکه‌کان گـه‌وره‌یان ده‌کاته‌وه.

ئێنجـا ئـه‌م قـسه‌یه‌ش- بـه‌کافردانان- خـۆی له‌خۆیـدا نـه‌زانی‌و نه‌فامییه‌کی گه‌وره‌یه.

ئیدی ئه‌وه‌ی موسڵمانی دی له‌سـه‌ر هه‌ڵـه‌کان بـه‌کافر و بـێ بـاوه‌ڕ له‌قه‌ڵه‌م ده‌دا با بزانی که پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی:

﴿ئه‌وه‌ی به برایه‌کی خۆی گوت: ئه‌ی کافر، یا بێ باوه‌ڕ، یا له ئایین وه‌رگه‌ڕای، ئه‌وا یه‌کێکیان ده‌گرێته‌وه، ئه‌گه‌ر ئه‌و به‌خۆی وایگوت و لێ پاشگه‌ز نه‌بووه.

ئه‌و که‌سه به‌خۆی کافره‌و، هه‌ر ئه‌مه‌شـه کـه پێغه‌مبـه‌رمان درودو سه‌لامی خوای له‌سه‌ر بێ فه‌رموویه‌تی: ئه‌گـه‌ر لـه‌لای خـوا لـه‌دنیاش کافر نه‌بێ چونکه نێردراوی خودا(ﷺ) فه‌رمووی: به‌هه‌ر هۆیه‌ك بێـت ده‌بێ یه‌کێکیان کافره‌که بێت.

الشیخ ابن عثیمین



# ترسان له سزای خوا

پرسیار: زۆر كەس لە گەنجان دەڵێ: لە سزای خوا دەترسێم و، لەگەڵ ئەمەش لە ئەركەكان كەمتەرخەمە. كاتێ دێتە سەر پێخەفی خۆی لە ترسان قورئان لەلای سەری خۆی دادەنێ بێ ئەوەی بیخوێنێتەوەو لەمەش هەست بە ئارامی دەكاتو دەخەوێت، ئایا ئەم كارە بەجێیە؟ ئەی ئەو كەسەی لە خوا دەترسێ دەبێ كارو كردەوەی چۆن بێ؟

وەڵام: ئەوەی بەڕاستی لە خوا بترسێ بەهەر حاڵ دەبێ بەرهەمەكەی بەر بگرێ ئەویش ئەوەیە بەڕاستی خوای گەورە بپەرستێ و، لەوەی خواو پێغەمبەر (ﷺ) قەدەغەیان كردووە دەبێ لێیان دووربكەوێتەوە، بۆ نموونە هەر وەكو ئەوەی لە شێر دەترسێ پێویستە هەوڵی ئەو هۆیانە بدات كە لە شێرەكە دەیپارێزێ.

ئەوەی لە ئاگریش دەترسێت لەبەر هەر هۆیەك بێت ئەگەر ترسەكەی ڕاست بێت دەبێ هەوڵی هۆیەك یا هەوڵی دەربازبوونێك بدات تاكو لە ئاگرەكە رزگاری بێت و خۆی لێ دوور بكاتەوە. بەڵام ئەوەی ئەم پەیوەستدارە دەیكات كە كتێبی قورئان لەلای سەری خۆی دادەنێت ئەمە خۆی لە خۆیدا شتێكە لەهەڵبەستراوی نوێ چونكە ئەمە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) نەهاتووەو هەروەها ئەوەی بیزانم لە یاوەرەكانیشی نەهاتووە. نەشمانبیستووە لەهیچ سەردەمێكی گەشەی

ئایینی ئیسلام کەسێك ئەمەی کردبێ و بەڵکو پێویستە مرۆڤ خودی خۆی لەسەر خوێندنی قورئان رابهێنێ بەمەش دڵ و دەروونی هێمن و ئارام دەبێتەوەو لەناخی مێشکی خۆیشی دڵنیا دەبێتەوەو هەڵبەتە ئەمەش لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووەو ئەویش لەنێو قورئاندایەو یا لە دوعای پێش خەوتندایە سەرجەم ئەمانەش کردەوەی چاکن و لەو کتێبانەی پێوەند بەم مەسەلانە باس کراون.

الشيخ ابن عثيمين







# لاساییکردنەوە یا خۆ بە ئافرەت چوواندن

پرسیار: لەو ماوانەی دوایی دیاردەیەك لەنێوان گەنجان بەتایبەتی گەنجانی پەیوەستدار بڵاوبووەتەوە ئەویش ئەوەیە کە سەعاتی شێوەی رەنگی زێڕین یا زنجیرێك لە شێوەی خشڵی دەستی ئافرەتان لەدەست دەکەن، یا ئەگەر قۆپچەی یێخەی هەندێ لەو گەنجە پەیوەستدارانەش بکەیتەوە سەیر دەکەیت زنجیری زیوینیان لەمل کردووەو شێوەی شتێکی دنیایشیان پێوەکردووەو، هەروەها هەندێکیشیان سەعاتیان لەدەستی راستە کردووە، تکایە دەربارەی بابەتی رابواردن و خۆشگوزەرانی ئامۆژگارییەك ئاراستەی ئەم جۆرە گەنجانە بکەنەوە بەتایبەتیش دەربارەی بابەتی لاسایی نەکردنەوەی ئافرەتان؟

وەڵام: من تکام وایە لە پەنجا کەسی ئێوەو پتریش چاوم بەم دیاردەیە نەکەوێت، وابزانم ئەمە هەر نییە، ئەوەی شتێکی لەم بابەتەی لەلایە، هەر ئێستا نیشانمان بدات، تاکو دوای ئەوەی شێوەی شتەکە بە چاکی دەبینین ئینجا دەتوانین بڕیاری لەسەر بدەین.

بێگومان خوای گەورە، کە هیچ شتێك زیندەوەرێك جوولەیەك نییە لەسەر رووی ئەم زەمینە، لە ئاسمان لەنێو دەریا، ئەگەر خواوەندی



گەورە لێی ئاگادار نەبێت، هەر بەخۆیشی بەسەر هەموو بەندەکانی خۆی زاڵەو زاناو شارەزایە، هەر بەخۆیشی ژن و پیاوی داهێناوەو بەگەورەیی خۆیشی لەیەکدی جیاوازی کردوون، هەروەها لە مەسەلەی جلوبەرگ‌و گرنگی بەخۆدانیش جیاوازی کردوون بەگەورەیی‌و بەرزێتی خۆی دەفەرمووێت:

﴿ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَـٰدُ ٱلرَّحْمَـٰنِ إِنَـٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ شَهَـٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَـٰنُ مَا عَبَدْنَـٰهُم ۗ مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾ الزخرف:١٩-٢٠.

واتە: وە ئەو فریشتانەی کە بەندەی خوای بەخشندەن بە مێیینەیان دادەنا، ئایا ئەوان بە دیاری دورستکردنیانەوە بوون، بێگومان ئەو شایەتی یانەی دەنووسرێت و پرسیاریان لێدەکرێ، وە دەڵێن ئەگەر خوا بیویستایە ئێمە ئەو (فریشتا) نەمان نەدەپەرست، هیچ زانیاری یەکیان نیە لەو بارەیەوە، ئەوانە هەر درۆ دەکەن.

هەروەها خوای شکۆمەند دەفەرمووێت:



﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ ﴾ الزخرف :١٧

واته کاتیَ مژده بەیەکیَ لەوان بدریَ، بەوەی بەنموونە بۆ خوایی دادەنا، رووی رەش هەڵدەگەڕیَ و پشووی خۆی دەخواتەوە.

کیَ بوو ئەوەی بەنموونەی خواییان دادەنا؟

ئەوانە بوون کە فریشتەیان کردە میێینە، فەرمووی:

﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ ﴾الزخرف ١٧-١٨

واته: وە کاتیَ مژده بەیەکیَ لەوان بدریَ، بەوەی بە نموونە بۆ خوایی دادەنا، رووی رەش هەڵدەگەڕیَ و پشووی خۆی دەخواتەوە، ئایا ئەو (کچە)ی لەناو ئاڵتوون و خشلا بەخێو کرابیَ و، لە کاتی دەمەقاڵێدا ناتوانیَ مەبەستی خۆی دەربڕیَ.

کێیە ئەوەی لەنێو خشڵ و ئاڵتوون گەورە دەبیَ بەمانای لە نێو خشڵ و ئاڵتوون پەروەردە دەبیَ.



ئەو کەسە ئافرەتە، ئەو لەشەڕو دەمەقاڵێدا دیار نییە، کەچی پیاو هەست بە خودی خۆی دەکات و پێویست بەوە نییە خودی تەواو بکات، هەر ئەویش لەشەڕو ناکۆکیدا دیارەو بەرگری لەخۆی دەکات، کەواتە چۆن دەکرێ پیاو ئاستی خۆی دابەزێنێت و خۆی وەکو نموونەی ئافرەت لێبکات.

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) نەفرەتی لەو پیاوانە کردووە کە خۆیان لە شێوەی ئافرەت دەنوێنن و هەروەها نەفرەتی لەو ئافرەتانەش کردووە کە خۆیان لە شێوەی پیاو دەنوێنن، سەعات ئەوەی تەنیا ئافرەتان بەکاری دەهێنن‌و لەوەستیان دەکەن نابێت پیاو بەکاریبهێنی و لەدەستی بکات ئەمەش ڕەنگی چ سپی یا سوور یا ڕەش بووبێت.

گرنگی مەسەلەکە: ئەوەیە ئەگەر گوترا ئەمە سەعاتی ئافرەتە، ئەمە ناکرێ پیاو بەکاریبهێنێ و لەدەستی بکات و، بەڵام ئەگەر لەشێوەی سەعاتی ئافرەتان نەبوو بەڵام شتی لە ئاڵتوون تێدابوو، ئێمە سەیر دەکەین، ئەگەر زێڕەکە تەنیا ڕەنگ بوو ئەمە حەرام نیەو، بەڵام ئامۆژگاری پیاو دەکەین کە بەکاری نەهێنێ و لەدەستی نەکات نەوەکو تاوانبار بکرێتەوەو خەڵکانی دی چاوی لێبکەن و لاسایی بکەنەوە.



ئینجا ئەگەر زێڕی تێدابوو و بە ئاوی زێڕ رووپۆش کرابوو ئەمە بۆ پیاوان حەڕامەو پێویستە نە بەکاری بهێنن و نە لەدەستی بکەن چونکە پێغەمبەر دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت لەبارەی ئاوریشم و ئاڵتوون فەرمووی: (بۆ نێرینەی نەتەوەی من حەڕامە ئەوەی بۆ مێیینەکانی حەڵاڵ کراوە).

الشيخ ابن عثيمين



# گونجاوترین شێواز لە بانگەوازدا

پرسیار: من گەنجێکم دەمەوێ ببمە بانگەوازکارو، بەڵام هیچ شێوازێکی گونجاوم بەدەستەوە نییە، ئایا (سیدی) ئیسلامی و کتێبی ئیسلامی بەسوودە بۆ ئەوەی بتوانم بڵاویان بکەمەوە یا دابەشیان بکەمەوە. گونجاوترین شێوازم فێربکەن خوای گەورە پاداشتان بداتەوە.

وەڵام: بەڵێ، بێگومان مرۆڤ ناتوانێت بەخۆی بانگەواز بکات و، بەڵام دەتوانێت بە بڵاوکردنەوەی کتێب و (سیدی) یە بەسوودەکان سوود بە ئایین بگەیەنێت و، بەڵام لەبەر ئەوەی بەخۆی ناتوانێت ببێتە بانگەوازکاری ڕاست و دروست بۆیە پێویستە ئەم کتێب و (سیدی) یانە بە زانایانی ئایین نیشان بدات بۆ ئەوەی بزانێت چ هەڵەیەکیان تێدایەو ئەو پیاوەش سەربەخۆی ئەم شتانە بڵاونەکاتەوەو دابەشیان نەکاتەوە نەوەکو شتی هەڵەو نادروستیان تێدابێ و بەخۆی هەستی پێ نەکات.

هەورەها شێوازی دیکەش هەیە بۆ بڵاوکردنەوەو دابەشکردنی سیدی و کتێب. بانگەوازکار دەتوانێت لەگەڵ زانایەك ڕێکبکەوێت کە زانایەکە کتێبەکە بنووسێت و ئەویش ئەرکی چاپ و بڵاوکردنەوە لە



ئەستۆی خۆی بگرێت، بەمەش بانگەوازکار لەلای خوای گەورە کە لەهەموو شتێکی زیندوو و مردوو ئاگادارە پاداشتی گەورەی هەیەو خوای میهرەبانیش بەزەییداری بەزەییدارانە.

الشيخ ابن عثيمين







## لە نیازی خۆت لەگەڵ خودا راستگۆبە!

پرسیار: گەنجێکم حەز لە بانگەوازکاری دەکەم و بەڵام دوو رەوشتم هەیە:

یەکەم: کاری هێنانەوەی مەنی بەدەستی دەکەم و، هەوڵم دا وازیلێبهێنم، بەڵام نەمتوانی؟

دووەم: نوێژی بەیانیان ناکەم ئەگەرچی زۆر رسوای خۆشم دەکەم؟

سەلامی خواتان لێبێ، چ ئامۆژگارییەکەم دەکەن، تکاتان لێدەکەم دوعام بۆ بکەن و ئامادەبووان دڵنیا بکەنەوە خوا لە پەنای خۆی بتانگرێ و بتانپارێزێ.

وەڵام:

لەخوای گەورە داوا دەکەین کە توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەو خوایە تاك و تەنیایەی ئێمەی لە نەبوووەوە هێناوەتە ئەم شێوەیەی ئێستامان لە خوای گەورە داواکارین لەسەر بڕیاردانەکانی خۆمان جێگیرمان بکات ورەمان بەرز بکاتەوە تاکو بتوانین پەیمانەکان کە لەرووی خوای گەورە داومانە نەیانشکێنین و بیانپارێزین دەڵێم: ئەمە ئەگەر خوای مەزن ئارەزووی لێبێ لەدوا رۆژدا رێگای راستی پێ نیشان دەدات، چونکە ئەم کەسە خودی خۆی هەوڵ



دەدات خۆی لە دەسپەڕ قوتار بکات کە بـەخۆی هەسـت پـێ دەکـات کارێکی نابەجی دەکات.

ئەمەش بەخشین و چاکەیە لەلایەن خواوە، ئەوەی بەدڵسۆزی هەوڵی شتێك بدات کە بۆ پەیامی خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) ڕێگە خۆشکەر بێ و بەدڵی ساف و بێگـەرد خـوا بپەرسـتێ پێغەمبەرەکـەی (ﷺ) بناسـێ، خـوای مـەزن بەگـەورەیی خـۆی ئەگـەر راسـتی نیـازی لـێ بەدیکردو زانی لەو پەیمانە بـەردەوام دەبێـت، خـوای مـەزن یارمـەتی دەدات و لەسەر خواپەرستی ڕشتی دەکات. منیش بەم برایە دەڵێم:

لەگەڵ خوا نیـازت راسـت بـێ و لـەکاتی سـوژدەو نێـوان بـانگ و هەڵبەستانی نوێژو لەکۆتایی شەو، لەخوای گـەورە بپـاڕێوەو دەسـت بەخوێندنی قورئان بکە، چونکە ئەمە یارمەتیت دەدات کـە واز لـەم مەسەلەیە بهێنیت.

بەڵام دەربارەی نوێژی بەیانی: هەوڵ بدە زوو بخەویت چونکە ئەوانەی لە نوێژی بەیانی دوا دەکەون زۆربەیان خەو تەنگیان پێ هەڵدەچینێ و هێور نەبوونەوەی لەشی مرۆڤ لە کەم نووستن لەشی مرۆڤ گران دەکـات و بەربەسـتی بـۆ دروسـت دەکـات. زۆربـەی ئەوانـەی نوێـژی بـەیانی فەرامۆش دەکەن ئەو کەسانەن کە درەنگی شەو دەخـەون و، ئەمـەش پێچەوانەی ڕەوشتی پێغەمبەرە درودو سەلامی خوای لەسەر بێـت کـە



زۆر پێویستە ئاگاداری ئەم ڕەوشتە بین ئەوەی دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت دەیکرد رکی لە نووستنی پێش نوێژی عیشا دەبووەوەو رکی لە گفتوگۆ بەمانای قسەکردنی وای نوێژی عیشاش دەبووەوە، لەبەرچی؟

چونکە مرۆڤ ئەگەر دوای نوێژی عیشا زۆر مایەوە هەڵسانەوەی بۆ نوێژی بەیانی زەحمەت دەبێ.. بۆیە ئامۆژگاری ئەم برایە دەکەم کە شەوان زوو بنوێ و ئامۆژگاری خەڵکانی موسڵمانیش دەکەم ئەندامانی خێزانەکانی خۆیان بۆ نوێژی بەیانیان بەچاکی هۆشیار بکەنەوە تاکو تەواو بە ئاگایان نەهێنن وازیان لێ نەهێنن تاکو وەکو ئەو کەسە نەبێت کە دێت جارێك یا دوو جار بانگی ئافرەت یا کچ یا کوڕەکانی خۆی دەکاو ئینجا وازیان لێ دێنێ و دەڕوات و نازانێت بەئاگاهاتوون یا، نا.

بەڵام ئەم جۆرە گەنجانە پێویستیان بەوەیە کە پێیان بڵێیت:

هەڵسەو لەسەر سەری بوەستیت تاکو هەڵدەستێتەوەو، هەندێ لەگەنجەکانیش ئەوەی بۆ بەس نییە کە تەنیا هەڵستێتەوە لەوانەیە هەڵدەستێتەوەو دووبارە دەگەڕێتەوەو دەخەوێت، نموونەی ئەمانە دەستی بگرە تاکو دەیگەینیتە نێو گەرماو، ئەوانی دی لە دەرگایان



بدەو دیسان بەتوندی لەدەرگایان بدە بە پشتیوانی خودای گەورە دەرگا دەکەنەوەو ئیدی هەموو ئەندامانی خێزان نوێژی بەیانی خۆیان دەکەن.

الشيخ ابن عثيمين



# سزای فرۆشتنی شتومەکی حەرام

پرسیار: گەنجێك خواناسەو لە دوکانی عەتاری باوکی خۆی کار دەکاتو، ئەم دوکانەش هەندێ شتی خراپی وەکو جیگارەو وێنەی تێدا دەفرۆشرێت، ئەم کوڕە ئامۆژگاری باوکی خۆی کردو بەلاّم باوکەکە خۆی لێ تووڕە دەکات و دەڵێت: لەبەر ئەوەی حکوومەت ئەم شتومەکانەی هێناوەو خەڵك ئەم شتانە دەکڕن، ئەمە هیچ شتێکی تێدا نییە تاکو بۆ ئێمە گوناه بێت، باوکەکەش لەتەمەن گەورەیە، بەهەر حاڵ هەندێ لەوانەی بە نێو تەمەندا چوون قایل نابن کوڕەکانیان ئامۆژگارییان بکەن، سەلامی خوای گەورەتان لێبێ لەم مەسەلەیە چی ئاڕاستەی باوکم ددکەن؟

وەلاّم: یەکەمین: دەستخۆشی لەم گەنجە دەکەین کە خوا ڕێگای پەرستنی بۆ ڕووناك کردووەتەوەو بە خواناسینی خۆی پابەندە، چونکە ئەمە گەورەترین خێرو چاکەیە کە خوای گەورە بە بەندەی خۆی دەبەخشێ و ، لە پەیوەستی خۆی بە پەیامی خوا سەری بەرز دەکاتەوە، ئەمەش بۆ ئەم گەنجە بەخێرێکی گەورە دەژمێردرێت کە لە هەموو خێرو خۆشییەکی دنیا خێرترە.

دووەمین: ئامۆژگاری ئاراستەی باوکی دەکەین بەتایبەتی کە لە دواترین ماوەی تەمەنیەتی: خوای گەورەو بەهرەمەند بپەرستێت و،

لێی بترسێت، ئەمەش بزانێت کە تەنیا خوای مەزن رسقدەرە هەر ئەویش بەتەنیا رسقی ژیانی رۆژانەی بەندەی خۆی بەدەستەو رسقیش بەفرۆشتنی شتومەکە قەدەغەکراوەکان پەیدا نابێت، ئەو رسقەی بەرێگای فرۆشتنی شتومەکە قەدەغەکراوەکان پەیدا دەبێت ئەم رزقە نە خێری تێدایەو نە خواش بەخشینی خۆی تێدا دەکات، بەلکو بۆ خاوەنەکەی دەبێتە بەلای سەر.

لە قورئان و سوننەتدا زۆر بە چاك و روونی و هەروا بەتوندیش هۆشیاری داوە بە وانەی رسقی خۆیان بە حەرامی پەیدا دەکەن و لەگەڵ ئەمەش دەرخواردی خێزان و منداڵەکانی خۆیان دەدەن دواییش ئەو ماڵە حەرامە بۆ نەوەکانی خۆیان بەجێ دەهێڵن. پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرمووێت:

﴿خوا چاکەو جگە لە چاکە بە هیچ شتێکی دی قایل نابێت، خوای گەورەو میهرەبان ئەوەی بە نێرراوەکانی فرمان کردووە، هەمان فرمانیشی بە ئیماندارەکان کردووە.

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ۝٥١ ﴾ المؤمنون: ٥١.







واتە: ئەی نێرراوانی خـودا، لـە خـۆراكی پـاك (حـەڵاڵ) بخـۆن، وە كردەوەی چاك بكەن، (چونكە) بەڕاستی مـن بـەوەی ئێـوە دەیكـەن ئاگادارم.

هەروەها خوای مەزن دەفەرمویێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ ﴾البقرە: ١٧٢

واتـە: ئـەی ئـەو كەسـانەی كـە بڕواتـان هێنـاوە، بخـۆن، لـەو خواردەمەنییە پاكانەی كردوومان بە ڕۆزیتان، وە سوپاسی خوا بكـەن، ئەگەر ئێوە هەر ئەو دەپەرستن.

هەروەها دەربارەی ئەو دەروێشەی ئەم دێ و ئەو دێ دەكاو هـاواری خودا دەكا خۆراكی حەرامەو، جلوبەرگی حەڕامـەو، هـەر بـەخۆراكی حـەڕامیش فرسـكی گرتـووە ئەمـە هـەرگیز لـە لای خـوای گـەورە قابلبوونی نییەو وەڵامیش نادرێتەوە.

لە وتارێكی (ابن مسعود) دا هاتووە:

(ئەو كەسەی ماڵ و سامانی بەسەریەكەوە دانـاوە (بـە مانـای بـە حەڕامی پەیدای كردووە) ئەگەر زەكات بدات لێی قەبووڵ نابێ، ئەگەر



بەخشیشی بۆی بەخێر حسێب نابێ و، ئەگەر لەدوای خۆیشی بەجێی هێشت دەخرێتە نێو ئاگرەوە. تکا لە پیرەمێردی باوکت ئەو پیاوە ئیمانداره دەکەم بەم ئامۆژگاری و بەم دیارییەمان قایل بێت، ئێمە ئەم باسەمان بۆ بەرژەوەندی ئەو و بەرژەوەندی کوڕەکانی دوای خۆی کردووە.

بەڵام دەربارەی ئەو گەنجەی کە باوکی فرمانی پێدەکا شتومەك لە نێو دوکانە عەتارییەکەی بفرۆشی کە هەندێ شتی حەڕامی تێدایە، من پێی دەڵێم:

لەمە گوێڕایەڵی باوکت مەبە، لە دوکانەکە دانیشەو شتە ڕێگەپێدراوەکان بفرۆشەو شتە قەدەغەکراوەکان مەفرۆشتە، چونکە هەرگیز خوا پەرستی بەندە لەگەڵ یاخی بوونو کردەوە نەهی لێکراوەکان یەگدی ناگرێتەوە.

هەوەرها قسەی باوکت بۆ تۆ کە دەڵێت: ئەم شتە قەیناکە چونکە حکوومەت ڕێگەی پێداوەو دەهێلێت بفرۆشرێت.

منیش دەڵێم: یەکەمین جار پەند لە کیتاب و سوونەدایەو نە بە ئیش و کاری حکوومەتەوە نەبە ئیش و کاری خەڵکیشە چونکە خوای مەزن کە لەهەموو شتێکی بەندەکانی خۆی ئەوەی زیندەوەر بێت،



لەکارو کردەوەی، لە ژیانی ڕۆژانەی، لە بـژێوی، لـە ژیـان و مردنـی، لەهەموو شتێك چاودێرو ئاگادارە دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾ ﴾النساء: ٥٩.

واتە: ئەی ئەو کەسانەی کـە باوەڕتـان هێنـاوە، گوێڕایـەڵی خـواو گوێڕایـەڵی پێغەمبـەر بـن، وە پاشـانیش گوێڕایـەڵی کاربەدەسـتە (عادیلە) کانی خۆتان بن، جا ئەگەر دووبەرەکیتان لە شتێکدا هـەبوو، ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبـەر(ﷺ) ئەگـەر ئێـوە باوەڕتـان بەخوا هەیەو، بـەڕۆژی دوایـی، ئـەوە باشـترە، وە ئاکـام و ئـەنجامی چاکترە.

فەرموو سەیرکە لێرە خوای گەورە دەفەرمووێت ئەگـەر ناکۆکیتـان لەگەڵ بەخێوکارو کاربەدەستانی خۆتان هەبوو، ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خواو پێغەمبەر (ﷺ) لەمەش دووپاتی ئەمـە دەکاتـەوە کـە ئەگـەر ئێوە باوەڕتان بەخواو دوا ڕۆژ هەیە.

ئەم پاساوەش لـە ڕۆژی زیندووبوونـەوە لـەلای خـوا دادی نـادات، چونکە خوای مەزن دەفەرمووێت:







﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبْتُمُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٦٥﴾ ﴾ القـــــصص: ٦٥

واتە: وە ڕۆژێ کە (خوا) بانگیان دەکات و (پێیـان) دەفـەرمووێ، چیتان وەڵامی پێغەمبەران داوەتەوە. لە دنیاش لەلای تێگەیـشتووان لەو خەڵکانەی باوەڕیان بەخوایەو خـوا ناسـن هـیچ شـتێك جگـە لـە کیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) سوودیان پێ ناگـەیێنێ، چونکە هەموو باوەڕکارو خواناسێك نـاکرێ ئـیش و کـاری خـەڵك یـا پێڕەوو پرۆگرامی حکوومەت کە (ناعادیل) بوو پێڕەو بکات و کیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بەلاوە بنێت، ترسیش لەوەدایە ئـەوەی لە ئیش و کاری حکوومەت ناڕازی بێت وەکو ئەوە بێت کـە دەربـارەی ئەمانە دەفەرمووێت:

﴿ إِذْ تَبَرَّأَ ٱلَّذِينَ ٱتُّبِعُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ وَرَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ ٱلْأَسْبَابُ ﴿١٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوا۟ لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا۟ مِنَّا ۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿١٦٧﴾ ﴾البقرە: ١٦٦-١٦٧







واتە: کاتێك لە پیشەواکان یەخە هەڵدەتەکێنن، لەوانەی (لە دنیا)دا دوایان کەوتوون، وە سزایان (بە چاوی خۆیان) بینین وە هەموو پەیوەندییەکیان بچڕایەوە، وە ئەوانەی کە دوایان کەوتبوون ووتیان، خۆزگە ئێمە بگەڕاینایەتەوە( بۆ دنیا) تا یەخەمان لێ هەڵ بتەکاندایە، هەروەك (ئەوان) یەخەیان لە ئێمە هەڵتەکاند، ئاوا، خوا کردەوەکانیان نیشان ئەدات، بەداخ لەسەر دڵیان، وە ئەوان دەرچوونیان نییە، لە ئاگر.

پوختەی وەڵام چوار شتن:

یەکەم: پیرۆزبایی لەو کەسەی خوای دلۆڤان چاکەی بڕوایی و هۆش و عەقڵی داوەتێ کە بەرێگەی ڕاستی خواناسی بەدڵ و دەروونو ناخێکی بێ گەرد گرتووە.

دووەم: ئامۆژگاری باوك دەکەین واز لەم کارە بێنێ.

سێیەم: دڵنیاین ئەو کوڕەی باوکی لە دوکانەکەی خۆی بەجێی دەهێڵێ بڕوای بە خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ) هەیەو شتومەکی حەڵاڵ دەفرۆشێ و ئەوەی خواو سوننەت قەدەغەی کردووە نافرۆشێ.

چوارەم: سەرچاوە بۆ ئەحکامە شەرعییەکان ئەوە نییە ئەوەی حکومەت بڕیاری بۆ دەدا یا بڕیاری بۆ نادا یا کاری کردەوەو خوو ڕەوشت و هەڵسوکەوتی ژیانی ڕۆژانەی بژێوی و قسەو بڕیاری خەڵکیش



نییە کە ژیانی خۆیان لە دنیا بەسەر دەبەن، بەڵکو سەرچاوەی ڕاست و دروست گەڕانەوەیە بۆ کیتابی خواو سوننەتی نێرراویەتی (ﷺ).

الشيخ إبن عثيمين







# خواپەرستی بە پێی توانا

پرسیار: ئێمە کۆمەڵێکین لـە هاوڕێیـان بـۆ مەبەسـتی گفتوگـۆ و دیـالۆك دەربـارەی دنیـاو ئـایین کۆدەبینـەوە، کەچـی یـەکێك لـە ئامادەبووان پرسیارێك ئاراستەی هەموومان دەکات و تێیدا دەڵێ: ئایا مرۆڤی موسڵمان دەتوانێت بژیت کە ١٠٠٪ ژیـانی موسـڵمانانە بێـت لەگەڵ ئەوەی کە ژیانی رۆژانـەو هەڵـسوکەوتی لەگـەڵ کۆمەڵگەکـەی خـۆی بـەردەوام بێـت ئەمـە سـەرەڕای ئـەوەی ژیـانی رۆژانـەو هەڵسوکەوتەکەی لە نێو کۆمەڵگەکەی خۆی زۆر شتی چاك و خراپ و کاریگەریشی تێدایە بەو مانایەی ئەگەر ئەو مرۆڤە موسـڵمانە لـەوەی خوای گـەورە قەدەغـەی کـردووە لێـی دوور بکەوێتـەوەو ئـەوەی لـە قورئاندا هاتووە پەیڕەوی بکات و ئەوەی سوننەتی پێغەمبەریشە(ﷺ) بیکاو جگە لەوەی حەڵاڵە مەیلی هیچ شتێکی دی نەکات لەسەر رێ و شـوێنی (محمـد-ﷺ-) بـڕوات، لەهـەموو شـتێکی قەدەغـەکراو دووربکەوێتەوە؟

لەسـەر ئـەم بابەتـە وەڵامـەکان هەنـدێ جیـاواز بـوون ئەگەرچـی هەمووشیان بە (بەڵێ) وەڵامیان داوەتەوەو بەڵام وەڵامـەکان دەربـارەی رێژەکەی جیاواز بوون، کۆمەڵێك گوتیان مـرۆڤ توانـای هەیـە ١٠٠٪ موسڵمان بێت، کەچی کۆمەڵێیکی دیکە لەسەر ئەوە قایل نەبوون کە



مرۆڤ لەم سەردەمە بتوانێت ژیانێکی موسڵمانانە ١٪ بـژیت، راو بۆچوونی ئەو کۆمەڵەی دوایی کە قایل نەبوو بـەوەی مـرۆڤ بتوانێـت بەرێژەی سەد لەسەد بژیت ئەوەبوو کە توانای کۆمەڵگـەو کاریگەرییـە جۆراو جۆرەکانی کارێکی گەورەی لەسەر تاکـدا هەیـەو لەوانەشـە زۆر شتی ناڕاست و دروست پێویست دەبێ رۆژانە جێبەجێی بکەیت و هـەر ئەمانەش حکوومەت (هـەر حکوومـەتێك) بڕیـاری بـۆ دەدەن کەئـەم شـتانە ببنـە بەشـێك لـە پێکهاتـەی مـاوەی ژیـانی رۆژانـەی هـەر موسڵمانێك، هەر ئەم کۆمەڵەیە یاری تۆپی پێ بە نموونە دێننـەوە کـە حکوومەت هەوڵ دەدات هانی ئەم یارییە بدات سەرەڕای ئەوەی هێندە سوودی گەنجانی تێدا نییە وەکو ئەوەی ئەگەر بۆ نموونە گـەنجان لەسـەر سوارچاکی و مەلەوانیو تیرهاوێژی رابهێندرێن. نموونەیەکی دی وێنـەو وێنە تەندارەکان.

نموونەیەکی دی پێوەندی بە خۆراکی مرۆڤـەوە هەیـە کـە دەوڵـەت هاوردەی دەکات وەکو ئەو خۆراك و خواردنەی لە دەرەوە دەهێنـدرێن، نموونەیەکی دی سوودی بانکـەکان، هـەروەها زۆر نموونـەی دیکەشـیان هێنایەوەو، کـاتێ گفتوگۆیەکـە درێـژەی کێـشا لەسـەر هەنـدێ خـاڵ رێککەوتین و لـە هەنـدێکی دی بیروڕامـان جیـاواز بـوو، ئێمـە ئـەم







پرسیارە بۆ بەڕێزتان ڕەوانە دەکەین بەڵکو لەلای ئێوە وەڵامی ڕاست و دروست و بڕواپێهێنەرمان بەچنگ بکەوێت.

وەڵام: لە ڕاستیدا موسڵمان لە گوناھ و تاوان و داوێـن پیـسی دوور نییە، لەھەڵەو شتی نادروست دوور نییـە، نێـوان چـاکەو خراپـە یـەك کەڵە مووی باریکە، خودی مرۆڤ سادەو نەفامە، ھەموو نـەوەی ئـادەم ھەڵـەکارن باشـترین ھەڵـەکارەکان تەوبـەکارەکانن ھـەر وەکـو لـە فەرموودەی پیرۆزدا ھاتووە، بەڵام دەکرێ و لە تواناڈا ھەیە کە مرۆڤی موسڵمان لە کۆمەڵگەیەکی موسڵمانی پارێزکاردا بـژیت ئەمـەش بـە پێی توانـاو خـود گـیری خـۆی، ھەڵبەتـە ئەمـەش بـە گـوێرەی ئـەم فەرموودەیەی خوای مەزنە:

﴿ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٦ ﴾
التغابن: ١٦

واتە: کەوابوو لە خوا بترسن ئەوەندەی کە دەتوانن.

مرۆڤی خواناس لە ئایینەکـەی خـۆی ئەگـەر ھەڵەیـەکی کـرد یـا ھەڵەیەکی لێ ڕوودا کە بەئقەست نەبووبێ و وا تێبگـات بـە گـوێرەی لێکدانەوەی خـۆی یـا ئـەو زانیارییانـەی کـە ھەیـەتی بەمـە ئـایین و



بڕوایەکەی لەکەدار نابێ، یا ئەوەتا ئەو هەڵەیەی کە دەیکـات لەسـەر وەڵامی پرسیاری خۆی بێت کە خـاوەن زانـستانی کردبێـت و دانـان و لێکدانەوەکەی خاوەن زانست بۆی دانابێ و بۆی لێکدابێتەوەو دانـان و لێکدانەوەکەش لەگەڵ شەرعی بێ گەرد یەکنەگرێتەوە، بەمە ئـایین و بڕوای برای موسڵمان لەق و لاواز نابێت.

کورتەی ئەم وەڵامە: پێویستە لەسەر موسڵمان بەپێی توانای خـۆی خوا بپەرستێ، ئەو شتانە لە خۆی قەدەغە بکـا ئـەوەی خـوای مـەزن لەسەری حەڕام کردووە، ئەوەی پێویستیشە لەسەری کە ئـایینی خـوا پێویستی کردووە دەبێ بیکاو جێبەجێیان بکات، هەر هەڵەیەکیش کـە لێی ڕوویدا هەر چەندە بچووك بێت یا گـەورە بێـت پێویـستە تەوبـەی ئێجگاری بکات.

الشیخ إبن باز







## بەشەکانی کاروکردەوە چاکەکان

پرسیار: ئایا موسڵمان ئەگەر کارێك یا هەر کارێـك لـە کارەکـانی بەبێ نیـاز کـرد پاداشـتی دەدرێتـەوە، وەکـو لابردنـی کەرەسـەیەکی ئازاردەر لە ڕێگایەکی گشتی، یا وەکو تەوقەکردنو دانیشتن لە کـۆڕی ئایینی بێ ئەوەی لێی بە نیازی پاداشت بێت لەلای خوای گەورەوە؟

وەڵام: کارو کردەوە چاکەکان دوو بەشن:

جۆری یەکەم: هەندێ کارو کردەوە هەیە پێویستن و لـە سـوودی بـۆ خەڵکی دی پتر نییە. ئەگەر ئـەو کارانـە جێبـەجێ بکـەیت بـەنیازی پاداشت ئەگەرچـی بـە نیـازی پێویـستی سەرشـانی مرۆڤـە بەرانبـەر کۆمەڵگەکەی خۆی بیکات، ئەمەش مانای ئەوەیە ئەگـەر بـە نیـازی پاداشتیش نەبیت تەنیا بەنیازی ئەرکێکی سەر شانی بێ بەرانبـەر بـە کۆمەڵ ئەمە پاداشتی لەسەر دەبێ.

جـۆری دووەم: زۆر جـۆرە پەرسـتن هەیـە سـوود بەخـەڵکی دی دەگەیێنێت ئەمانە کە بۆ خەڵکی دی سوودبەخشن هەڵبەتە پاداشتیان دەدرێتەوە جا ئەگەر چی بەنیازیش نەبێت، بۆ ئەمـەش پێغەمبـەرمان (ﷺ) دەرفەرمووێت ئەو کەسـەی نـەمامێك بـچێنێت یـا ڕووەکێـك بڕوێنێت ئاژەلێك لێی تێر بخوات یا هەر کەسێکی دی بەرەکەی بخـوات



ئەمە پاداشتی بۆ هەیە ئەگەرچی ئەمامەکە دەچێنێت و نیازیشی لەمەدا نییە ئێنجا لەبەر ئەوەی سوودی بەخەڵك گەیاند ئەمە پاداشتی لەسەرە، هەڵبەتە ئەمەش نیشانە بەم فەرموودەیەی خوای مەزنە:

﴿ ۞ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ .... ﴾ النساء: ١١٤

واتە: هیچ چاکەیەك نییە لە زۆر چپەو سرتە کردنەکانیان دا، مەگەر یەکێك فرمان بکات بەماڵ بەخشین یان چاکە، یان چاککردنی نێوان خەڵکی.

ئیدی هەر ئەوەیە کە مرۆڤ بەبێ نیاز بۆ چاککردن و ئاوەدانیو ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵ دەیکات بێ ئەوەی چاودڕوانی پاداشت بێ کەچی ئەمەش خێری گەورەیە، ئینجا خوای مەزن دەفەرمووێت:

﴿ .....وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾ ﴾ النساء: ١١٤

واتە: جا هەر کەسێك ئەوە بکات، بەنیازی ڕەزامەندی خودا، ئەوە لەداهاتوودا پێی دەبەخشین، پاداشتی زۆر گەورە، بێگومان چاکەو کردەوەی چاك و هەڵسوکەوتی جوانو خوو ڕەوشتی ڕێکوپێکی گەنجی موسڵمان کە ڕەچاوی پێکەوە ژیانو ئاسوودەیی نێو کۆمەڵگە بکات







ئەمانە خێرەکی پترن لەوەی خوای گەورە لەسەرەتای ئایەتەکە ناوی هێناون، لادانی شتێك كەرەسەیەك لەسەر رێگایەك هاتووچۆی خەڵكی دیكەی لەسەر بێت ئەمە ئەگەرچی بەنیازیش نەبێت بۆ كۆمەڵ سوودبەخشەو مرۆڤ پاداشتی دەدرێتەوە، جا لەو كارە بەسوودانەی مرۆڤ هەرچەند بچووك بێت لەم ئایەتە پاكانە باس دەكرێت یا ئەگەر گەورە بێت وەكو داهێنانە گەورەكان، یا پردەكان، یا تونیلەكان، سوودبەخشن‌و لەرۆژی دوایی لەلای خوای پەروەردگار پاداشتی خۆیان هەیە.

الشیخ ابن عثیمین






# گەنجێك نوێژەكان دەكات و هەندێ كردەوەی خراپیش دەكات

پرسیار: من نوێژەكان دەكەم و بەڵام هەندێ كردەوەی خراپیش دەكەم ئامۆژگاریتان بۆمن چییە؟ لەبەرچی نوێژەكانم لەكردەوەی خراپ دوورم ناكەنەوە؟

وەڵام: ئامۆژگاریم بۆ تۆ، بەرانبەر بە خوای گەورە ئەوەیە كە تەوبەی بكەی، ئەو خوایەی تاك و تەنیایە، ئەو خوایەی بێ نیازو جێی نیازو ئومێدە، كەسی لی نەبووەو لەكەس نەبوود، وە هەرگیز هیچ كەس هاوشێوەو هاوتای نییە كاتێ بەرانبەر خوای مەزن كڕنۆش دەبەیت پێویستە بەڕاستی هەست بەمەزنێتی بكەیت، هەست بە شكۆمەندی و میهرەبانی بكەیت، ئەوەش بزانیت ئەوەی لەخوای داهێنەر كە دروستكەری سەرجەم زیندوو و مردووانە سزای گەورەی هەیەو ئەوەی لێی یاخی بێت سزایەكی ئازاردەری بێ پایانی دەدات و ئەو فەرمودەیەی خوای گەورەش بخوێنیتەوە كە دەفەرموێ:

﴿ ۞ نَبِّئْ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ ﴾الحجر: ٤٩-٥٠.



واتە: هەواڵ بدە بەبەندەکانم، کـە بەڕاسـتی هـەر مـن لێبـووردەی میهرەبانم، وە بێ گومان هەر سزای منە سزای سەخت.

ئەی خودایە لێی ببوریت و بەزەیی پێ بکەیتەوەو ئازارەکەی لەسەر سووک بکەیتەوە.

بەڵام کە تۆ نوێژ دەکەیت و نوێژەکانت لە کردەوەی خراپ ناتپارێزن لەوانەیە نوێژەکانت کەموکوڕییان تێدا بێت، چونکە ئـەو نوێـژەی کـە نوێژکار لە درۆ و دزی و ساختەو کردەوە بەدەکانی دی دەپارێزێت ئـەو نوێژانەیە کە لە دڵ و دەروونێکـی بـێ گـەرد بەرانبـەر خـوای گـەورە کڕنۆش بەرێت، ئەو نوێژانەیە کە بە بڕوایەکی تەواوی راست و دروسـت خـوای گـەورەت ناسـیبێت و هەسـت بـە مـەزنێتی بکـەیت بـڕوای تەواویشت بەمە بێت کە خـوای گـەورە چـۆن ژیاندوویـەتی هـەر بـەم شـێوەیەش دەتمرێنێـت و دووبـارە زینـدووت دەکاتـەوەو بـۆ هـەر کاروکردەوەیەکی چاك و خـراپ چ گـەورە بێـت یـا بـچووك پاداشـتی گەورەو سزای ئازاردەر هەیە. نوێژی راسـتو دروسـتی بـەو مانایـەش وەك ئەوەی لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆمان ماوەتەوە، کـە پێـشتر دڵ و دەروونی بۆ خاوێن دەکرێتەوە بە نیازی پەرستنێکی راسـت خـودی بـۆ ئامادە دەکرێت هەمیشە نوێژ کردنیش وەکو ئەوەیە کە لـە سـوننەتدا هاتووە.



ئینجا هەموو نوێژێك مرۆڤ لـە کـردەوەی خـراپ دوور ناکاتـەوەو لەدەردو بەڵای دنیا ناپارێزێت، دەبێ نوێژ وەکو پێویست بکەیت وەکو ئەوەی بەشێکی تـەواو بنـچینەکای ئـاینی ئیـسلامەوە لەگەڵیـشیدا ئەوەی پێویستە لەسەرت جێبەجێی بکەیت.

لە ئایەتی –المائدە- ٥٣ –دا هـاتوو: ﴿......وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾ خـودای پـەروەردگار لـە هـەموو شـتێك، لەهـەموو جوڵانـەوەی گەردیلەیەکی ئەم گەردوونە ئاگادارە.

خوای شکۆدار دەفەرموویێت:

﴿ ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ ﴾ العنکبـــوت: ٤٥.

واتە: بیخوێنەرەوە،ئەو قورئانەی کە سرووش کراوە بـۆت، وە نوێـژ بکـە، بێگومـان نوێـژ بـەرگری (نوێـژکار) دەکـات لـە کـردەوەی پاپەسەند(خراپە).

الشیخ إبن عثیمین



# پێویستە نوێژنەکەر بیبوغزێنیت

پرسیار: هاوڕێیەکی ئـازیزم هەیـە زۆر خۆشـم دەوێـت، بـەڵام ئـەم هاوڕێیە نە نوێـژ دەکـات کـە لەسـەری پێویـستەو نـە لەرەمـەزانیش بەرۆژوو دەبێت، هەموو جارێك ئامۆژگاری دەکـەم و ئایـا بـەردەوام بم یا، نا.

وەڵام: ئەم پیاوەو نموونەکانی وەکـو ئـەو پێویـستە بیوغزێنـدرێن و دوژمنداری بکرێن تاکو تەوبە دەکـەن و دەگەڕێنـەوە ڕێگـەی ڕاسـتی ئایین و خوای مەزن دەناسن.

چونکە وازهێنان لە نوێژ کوفری گەورەیـە ئـەوەش ڕاسـتی قـسەی زانایانە بۆ فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ):

﴿لەنێوان پیاو و نێوان کوفرو هاوبەشی پەیداکردن بۆ خوا وازهێنانە لە نوێژ﴾ اخرجه مسلم في صحيحه.

هەروەها لە فەرموودەیەکی دی دروودو سەلامی خوای لەسەر بێت: ﴿ئەو شەرتو پەیمانەی لـەنێوان ئێمەیـەو لـەنێوان ئەوانـە نوێژکردنـە ئەوەی وازی لێبهێنێـت کـوفر دەکـات﴾. أخرجـه الامـام أحمـد وأهـل السسن باسناد صحيح.

ئیتر فەرموودەکانی بەم مانایە زۆرن.



-بەڵام بە ڕۆژوو نەبوونی ڕەمەزان بەبێ پاساوێکی شەرعی ئەمە لە گوناهە هەرە گەورەکانە، هەندێ لە زانایانی ئایینی گەیشتنە ئەو ڕادەیەی کە بڵێن ئەوەی لە ڕەمەزان بەبێ پاساوی شەرعی وەکو نەخۆشیو گەشت کردن بەڕۆژوو نابێت کوفری گەورە دەکات.

پێویستە لەسەرت بۆ ئەوەی لەخوا پەرستییەکەی خۆت بەردەوام بیت ئەم هاوڕێیە ببوغزێنیت و وازی لێ بهێنیت و خۆتی لی بپارێزیت تاکو تەوبە دەکات و دەگەڕێتەوە ڕێگەی ڕاستی خواناسی.

پێویستە لەسەر بەخێوکارانی موسڵمانان ئامۆژگاری ئەوانە بکەن کە وازیان لە نوێژ هێناوەو ڕێنماییان بکەن تاکو دەگەڕێتەوەو تەوبە دەکەن ئەگەر نا کوشتنیان پێویستە ئەمەش بە گوێرەی فەرموودەی خوای مەزن و توانادار هاتووە:

﴿ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمْ ﴾

لتوبە:٥.

واتە جا ئەگەر پەشیمان بوونەوەو، نوێژیان کردو، زەکاتیاندا، ئەوە ڕێیان پێبدەن بەڕەڵایان بکەن.

ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئەوەی نوێژ نەکات بەرەڵا ناکرێت، پیغەمبەریشمان (محمد-ﷺ-) دەفەرموویێت: ﴿ من کوشتنی نوێژکارانم قەدەغەکرد ﴾ ئەمەش هێمایەکی تەواوە بەو مانایەی ئەوەی



نوێژ نەکا هێشتا کوشتنی تەواو نەکردووە یا کۆتـایی پـێ نـەهێناوە.

هەموو بەڵگە شەرعییەکان لە ئایەت و فەرموودەکان بەڵگەو نیشانەی ڕاست و دروستن کە پێویستە لەسەر بـەخێوکاران ئـەوەی نوێـژ ناکـات بیکوژێت ئەگەر تەوبـە نـەکات، بەرانبـەر ڕووی پـاکی خـوای مـەزن دەستمان بەرزدەکەینەوەو بە دڵێکی پڕ لە بڕوا داوای لێدەکەین، هـاوار دەکەین، دەپاڕێینەوە کە ئەم هاوڕێیەت تەوبە بکـاتو بـەڵکو خـوای گەورە ڕێگای ڕووناکی پێ نیشان بدات و دەرگای پڕ لە بـەزەیی خـۆی بۆ واڵا بکاتەوە.

الشيخ إبن باز







## دەست بەوەختەوەگرتن لە ڕەمەزاندا

پرسیار: دەڵێت: شێخی بەڕێز، ئێمەی موسڵمان هەموومان دەزانین کاتێ مانگی ڕەمەزان دێت بێداری لە شەوان زۆر دەبێت، شەویش لەلای زۆر کەس بە خواپەرستی و خوێندنەوەی قورئان و دانیشتنی نێو کۆڕە ئاینییەکان بەسەر دەچێت، کەچی زۆر کەسانی دیکەش هەنە سات و وەختی شەوانەی مانگی ڕەمەزانی خۆیان ئەگەرچی نوێژەکان دەکەن و بەرۆژووش دەبن ئەم وەختە جوان و بەنرخەی خۆیان بە بینینی شانۆگەری یا نمایشە ئاینییەکان بەسەر دەبەن و ئینجا ئەم نمایشانە هەندێ لەشەڕە دێرینەکانی تێدایەو لەهەندێ برگەمش ئافرەتی سەرو مل والاو رووتی تێدایە، هەروەها زۆر لەگەنجانیش ئەم شەوە لە مانگی ڕەمەزان بە بێداری دوورودرێژ بەسەر دەبەن و تێیدا شتی وا دەکەن کە خوای شکۆمەند پێی ناخۆشە، یاری کاغەز یا تۆپ تۆپێن دەکەن و یا دەچنە دەشت و چۆلەوانی یا لەسەر شۆستەکان پاڵدەدەنەوەو کاتە جوانو بەنرخەکەی خۆیان بە قسەو گفتوگۆی بەتاڵی بێ مانا بەسەر دەبەن ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانت بۆ ئەم هەموو خەڵکە چییە چ پیر بن یا گەنج؟

وەڵام: ئامۆژگاری من بۆ ئەوانە ئەوەیە کە ئەم وەختە پیرۆزو بە بەهایە بە هەند هەڵبگرن، کە لە ژیانی مرۆڤی موسڵماندا یەک جار







دێت و جارێکی دی ناگەڕێتەوەو ساتو وەختێکی دیکەیان بەچنگ ناکەوێت که تێیدا بخەون یا قورئان بخوێننەوە.

دەست پێوەگرتن بە سات و وەخت لە ژیاندا زۆر گرنگە بەتایبەتی لە ژیانی گەنجانی موسڵمان، با دەست بەو وەختە پیرۆزەوە بگرن و قورئان بخوێننەوە تاکو خەو دەیانباتەوە. خۆزگە ئەگەر ئەو خەڵکە دوای تەراویحەکان کۆدەبوونەوەو قورئانیان دەخوێند و پرسیاریان ئاراستەی یەکدی دەکردو ئەگەر وەڵامیان بەچنگ بکەوتایە ئەگەرنا ڕوویان لە زانایان بکردایە تاکو وەڵامەکانیان بۆ دەدرایەوە، یەکێکیان هەندێکی بخوێندایەو ئەوی دی هەندێکی دی و ئەوەی لەدوای ئەو هەنەدێکی دیکەی بخوێندایە بە گوێرەی چالاکی خۆیان شەویان بەم شێوەیە بەسەر ببردایە، بەمەش بە چاکی خوێندنەوەو ماناکان فێر دەبوون، ئەمە خێری زیاترەو لەوە چاکترە کە ئەم سات و وەختە جوانەی تەمەنی گەنجایەتی بەبێ سوود بەرێ دەکەن، ئەمە جگە لەوەی کە لە پرسیارەکەدا هاتووە کە هەندێکیان شتی نابەجێ و حەرام دەکەن، بەڵام دەربارەی سەیرکردنی زنجیرە بێ مانایەکان کەلە فریودانو شەیدا کردن چی دی تێدا نییە(واتا سەیرنەکرێت).







# ئامۆژگاریم بۆ برایەکانم

تکام وایە پڕ بە دڵ ئەم ئامۆژگارییەم وەربگرن، ژیانی مرۆڤ زۆر بەنرخ و بە بەهایە بەتایبەتی تەمەنی گەنجایەتی، ئەم تەمەنە ساتە وەختێکە گەڕانەوەی نییە لەم تەمەنە خوا پەرستی و ناسینی بەراست و دروستی.زۆر مەرجە بۆ پتەوکرنو بەردەوامیو بۆ پێشەوە بردنی نەتەوەی موسڵمانو گەڕانەوە لەم تەمەنە بۆ خوای تواناداو دەسەڵاتدار مەرجێکی گەورەیەو هەمیشە پاداشتی گەورەشی بەدوایەوەیە. ئینجا ئێمە پێویستمان بە نووستن نییە کە لە رۆژێدا بخەوین رۆژ کورتەو وەخت ساردەو رۆژیش بۆ راپەڕاندنی ئیش و کارەکانە، خوێنەر لە قوتابخانەی خۆیەتی و، مامۆستا بە قوتابییەکانی خۆی خەریکەو، بازرگان لە نووسینگەی خۆیەتی و، فەرمانبەر لە فەرمانگەیەو پێویستمان بە نووستن و پاڵدانەوەی رۆژێ نییە، با شەو بۆ نووستن تەرخان بکەین و تێیدا قورئانی پیرۆز بخوێنینەوەو تاکو ئەوەی لە توانامانددا بوو لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین، چونکە خوێندنەوەو قووڵبوونەوە لە قورئان رۆشنبیرییەکت بۆ بەدەست دێنی کە لە کۆڕە ئایینییەکاندا دەتوانیت بە شانازییەوە بەشداری لە گفتوگۆکاندا بکەیت.

الشيخ ابن عثيمين



# سزای نیازکار بۆ وازهێنان لە کردەوەی خراپ

پرسیار: شێخی بەڕێز: من گەنجێکم نیازم کردووە واز لە کردەوەی خراپ بێنم و حەوت کەڕەت خۆم بۆ تەرککردنی کردەوەی خراپ ئامادەکردووەو هەر کەڕەتیش کە نیازی بۆ دەخوازم نیازەکە دەشکێنم و دەگەڕێمەوە سەر دۆخی خراپەکارییەکانی پێشوو، دیسانیش خۆمی بۆ ئامادە دەکەم، ئایا چ گوناه لەسەر من هەیەو، ئایا کەفارەتدانی هەیەو، ئایا بۆ من دەکرێ پێش کەفارەتدان سەردانی ماڵی خوا بکەم؟

وەڵام: ئامۆژگاری ئەو برایەمان دەکەم کە بۆ وازهێنان یا دوورکەوتنەوە لەهەر خراپییەك یا قەدەغەکراوێك نیازکردنو خۆ ئامادەکردنی لەخۆی نەکاتە بار چونکە ئەمە لە هەموو کردەوەیەکی خراپ و نابەجێ و قەدەغەکراو نیازی خۆپارێزی لێبکات ئەمە لە ئەنجامدا لێی دەبێتە خوو و لێی رادێ.

خوای مەزن، خودای تاك و تەنیا، تەنیا بەخۆی داهێنەرو گیانلەبەرخەری گشت زیندەوارانە دەفەرموێت:

﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ ۖ قُل لَّا تُقْسِمُوا۟ ۖ طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾ النور:٥٣.



واتە: (دوو ڕووەکان) سوێندتان دەخوارد بەخوا، بە ئەو پەڕی سوێند خواردنیان، کە ئەگەر فەرمانیان پێ بدەیت (بەدەرچوون بۆ غـەزا) بـێ گومان دەردەچن، بڵێ: سوێند مـەخۆن، ملکەچـی و گوێڕایـەلی ئێـوە زانراوە (قسـەتان پێچەوانەی کردارتانە)، بەڕاستی خـوا، ئاگـادارە بـەو کردەوانەی دەیکەن.

مـانای ئەوەیە کـە گوێڕایـەڵ بـن گوێڕایەڵییـەك کـە ناسـراو بـن‌و بناسرێن بێ ئەوەی سـوێند بخـۆن و پێویـستیش بـە سـوێند خـواردن ناکات، هەروەها پێویستیش بە شت لەخۆ گرتن یـا خـودی خـۆتی بـۆ ئامادەو تەرخان بکەیت، بڕوای خۆت بەهێز بکەو توانای خـۆت بـەکار بهێنە دەتوانیت ئەوەی شتی خراپەو کردەوەی قەدەغەکراوە بەبێ نیـاز لێگـرتن لێـی دوور بکەویتـەوەو خـودی خـۆتی لێبپارێزیـت، ئەمـە لەهەموو شت باشترەو یەکەمین هەنگاوە بۆ خواپارێزی و خـوا ناسـین، بەڵام ئەگەر لە دڵ و دەروونی خۆت نیازی ئەوەت کـرد کـە کـردەوەی ناپاکی نەکەیت‌و لێی دووربکەویتەوەو ئینجا دووبارە گەڕایتەوە سـەر کردەوەی خراپ، پێویستە لەسەر تۆ تەوبەی ئێگجاری بکەیت و ئەوەی موسڵمان و خواناس بێـت دەبـێ بزانێـت تەوبـەی ئیکجـاری هـەموو کەسێك ئەرکەکانی پێ هەڵناگیریت و پەشیمان بوونەوەی لەدوادا نییەو هەمیشە دەبێ ئەوەش بزانێت شـکاندنی تەوبـەی ئێجگـاری سـزای



گـەورەی بەدوایەوەیـە، هـەروەها پێویـستە لەسـەرت لەسـەر ئـەو پاشگەزبوونەوەیە کە سوێندت خواردووە لەگەڵ خوای گـەورە پـەیمانت بەستووەو شکاندووتە دەبێ کەفارەت بدەیت ئـەویش ئەوەیـە نـانی دە هەژاران بدەیت یا جلوبەرگیان بۆ بکەیت یا کەسێك لە کۆیلەیی رزگار بکەیت، ناندانیان دەبێ وەکو ئەوەی خەڵکی خۆتان لـە چـینی ناوەنـد خۆراکیان چی بێ هەمان خۆراك بێ؛ چـینی ناوەنـد ئیمـڕۆ خـۆراکی برنجـە، دە کـەس لـە هـەژاران نیـوەڕۆ یـا ئێـواران خـۆراکی برنجیـان دەدەیتێ، ئەگەر ویستت بە نەکولاوی بەسـەریاندا دابـەش بکـە، هـەر یەکێکیان بۆ نموونە نزیکەی کیلۆیەك لە گەڵێشیدا شتێك لە گۆشـتیان بـدێ بـەم شـێوەیە نیـاز لـە خۆگرتنەکـەت لەسـەر نـامینێ بـەلام دەگەڕێمەوەو دووبارە ئەمە دەڵێمەوە کـە پێویـست ناکـات مـرۆڤ بـۆ خواپەرستنی خۆی نیازی کردەوەی چاك بکات پێشتر ئەوەی لەدڵ بێـت کە لە کردەوەی خراپ دوور بکەوێتـەوە لەگـەڵ خـۆی پـەیمان بـدات و سوێند بخوات کە جارێکی دی سەیری زنجیرە نمایشکراوەکانی تەلەفزیۆن نەکات و کەچی بۆ بەیانی لەخەو هەڵبستێت و بۆ ئێوارێ کاتی شـەوێ سەر لەنوێ لەبەردەم تەلەفزیۆن دابنیشێت و سـەیری ئالقـەکانی دوای شەوی رابردوو بکات و ئەو پەیمانو سوێند خواردنـەی شـەوی پێـشتری لەبیر بچێت.



پێویستە گەنجی موسڵمان ئەمە زۆر چاك بزانێت کە خودی مرۆڤ (مەبەست قەبارەی لەشی مرۆڤ) لەسەدا ۹۷ی لە ئاو(شلە)پێکهاتووە ئەوەی دی ئێسقانەو ئێسقانەکەش ئەگەر بۆ تێگەیشتن روونی بکەینەوە و بیهاڕین ئەویش لەسەدا ۹۰ی شلەیەو ئەوەی دەمینێتەوە کە بەرجەستەیەو بەڕەقی دەمینێتەوە دەبێتە ئاردێکی هێندە ورد پەرداخێك پڕناکات. کەواتە مرۆڤ لە دوو شتی سەرەکی پێکهاتووە دەروونو لەش. ئێنجا ئەگەر لەشی مرۆڤ هەمووی پەرداخێك پڕ نەکات لەم مرۆڤە چی دەمینێتەوە، ئەوەی دەمینێتەوە دەروونە، ئەم دەروونە هەم گیانەو هەم بیرو هۆشە، ئەویش ئەگەر موسڵمانی راستیش بێ پێویستە خاوەن دەروونی خۆی بێت و بەهێز و بە توانا بێت و دەروونی پڕ بڕوای راستی بێت و خاوەن بیرو هۆشی چاك و دروست بێت و ئیدی هەر ئەمانەیە کە ئەم لەشە ئاوە بەڕێوەدەبەن بۆیە بۆ گەنجانی موسڵمان رۆشنبیری زۆر پێویستەو خوێندنەوەو روونکردنەوەو تێگەیشتن لە مەبەستی ئایەتە پاکەکان زۆر پێویستە ئەی خودایە، بە گەورەیی‌و مەزنێتی خۆت لە نەزانو نەفامان بمانپارێزیت هەر بەخۆت گەورەو شکۆکاریت ئەی بەزەییدارترین بەزەییداران.

بەلاّم دەربارەی سەردانی بۆ مالّی خوا(حەج) بەر لەوەی کەفارەتدانەکە بکات شتی چاکەو گوناه نییە، چونکە کەفارەتدانەکەش دەکرێ ئاسان بکرێت و ئەگەر نەیتوانی خۆراکی دە هەژاران بدات یا نەیتوانی جلوبەرگیان بۆ دابین بکات یا نەیتوانی کۆیلەیەك ئازاد بکات با سێ رۆژان لەسەر یەك بەرۆژوو بێت.

الشيخ ابن عثيمين






## ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی وازیان لە نوێژ هێناوە...

پرسیار: من گەنجێکی پەیوەستکارم و سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە کە چاکەی لەگەڵ کردووم دەرگای رووناکیو ناسینی خۆی بۆ واڵا کردووم و بەڵام کێشەیەکی گەورە سەرقاڵی کردووم ئەویش ئەوەیە چەند برایەکی هەیە نوێژی بە کۆمەڵ ناکەن و، هەروەها لەماڵەوەش نایکەنو بەرادەیەك نوێژی هەینیش ناکەن، جگە لەمانەش شتەحەرامەکان حەڵاڵ دەکەن و زۆر شتی خراپ و قەدەغەکراویش هەیە دەیکەن، من لەلایەن خۆمەوە هەڵسام چەند کاسێتێکی خوێندنی قورئانم بۆ هێنان تاکو گوێی لێ بگرن لەگەڵ ئەمەش چەند کەسانێکی خاوەن باوەرو بە ئەزموون ئەم برایانەی منیان ئامۆژگاری کرد کەچی هیچ چارەی نەبوو و لەسەر بێ باوەڕی و ملهوڕی خۆیان بەردەوام بوونو دواتر ئەهلی بڕواکارانیان پتر دەبوغزاند، ئومێدەوارم ئامۆژگاریتان بۆ من ببێتە پردێکی جوانو قەشەنگ بەڵکو برایەکانم لێی بپەڕنەوەو خوای گەورەش ئاسانکاری لەپەڕینەوەیان بکات و خوای گەورە بناسن و بیپەرستن هەورەها تکام وایە بەڕێزتان لەخوای گەورە بپارێنەوە تاکو برایەکانم بکەونە سەر ڕێگای ڕاست و منیش بحەسێمەوە؟



وەڵام: ئەوەی پێویستە لەسەر تۆ لە ئامۆژگاریکردنیان بەردەوام بەو لێی سل مەبەوە بەڵکو خوا بکا دەرگای عەقڵ و خێریان بۆ بکاتەوەو بێنەوە سەر هۆشی خۆیان، ئەگەر هەر ویستیان لەسەر بارودۆخ و بێ مێشکی خۆیان بەردەوام بن، بۆیان دڵگیرو غەمگین مەبە، خۆت نارەحەت مەکەو، دڵی خۆشت توند مەکە، ئەمەش چاك بزانە کە بەر لە تۆ نێرراوی خوا (ﷺ) بانگەوازی میللەتەکەی خۆی دەکرد، داوای لەمامی خۆی کرد کە لەسەرەمەرگدا بوو خەریکبوو گیانی دەدا داوایلێدەکردو دەیفەرموو﴿بڵێ هیچ پەرستراوێك نییە بەهەق تەنیا خوای گەوریە ئەم وشەیە بۆ تۆ لەلای خوای گەورەو پەروەردگار دەبێتە پاساو﴾ بەلام مامی -پەنا بەخوا-لەسەر بێباوەری خۆی بەخوای مەزن مکوڕ بوو، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: دوعات بۆ دەکەم و لەخوای گەورە دەپاڕێمەوە تاکو ئەو کاتەی دەتبەخشێ، دوا قسەی ئەوە بوو کە گوتی: مـن لەسەر ئاییني عەبدولموتەلیبم لە هاوبەش پەیداکاری، خوای مەزنیش بەگەورەیی و تواناداری خۆی ئەم (نهی) یەی دابەزاند:



﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن يَسْتَغْفِرُوا۟ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوٓا۟ أُو۟لِى قُرْبَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾ ﴾ التوبه: ١١٣

واته: ڕەواو شایستە نییە بۆ پێغەمبەرو باوەڕداران، کە داوای لێبووردن بکەن بۆ هاوبەش پەیداکاران، با خزمی نزیکیشیان بن، لەپاش ئەوەی کە بۆیان دەرکەتووە، کە بێگومان ئەو (هاوبەش دانەرانە) هاوەڵ و پێڕی دۆزەخن.

تۆش لەگەڵیان هەوڵ بدەو بێزار مەبە داوا لە خوای گەورە بکە کە لەو ڕێگە تاریکەی ئەوان گرتوویانە دڵیان نەرم بکات، هۆشیان بە بەرەوە بێنێت تاکو گزنگی ڕووناکی لە ئاسۆی ئایینی خوای مەزن و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بۆیان هەڵدێ. ئەگەر ئەوانە دایك و باوکیان هەبێ داوا لە دایك و باوك بکە بەڵکو ئەوان لەلای خودای گەورە بۆیان دەپاڕێنەوە چونکە دوعاو نزای دایكو باوك.بۆ کوڕەکانیان جێ ی خۆی دەگرێ و هەمیشە وەڵام دەدرێتەوە لەبەر ئەوەی داواکارییەکە بۆ کاری باش و ڕێگای ڕاست و خواپەرستی یە ئەگەر ئەوانیش نەیانویست کوڕەکانیان بگەڕێنەوە سەر خواپەرستی و کردەوەی باش با سەیری بەرژەوەندی بکات لەوانەیە مانەوەی ئەوان



لەلای باوك‌و دایکیان رۆژێ دابێ کە ئەوان بەخۆیان هەست بە شەرمەزاری و رووڕەشی خۆیان بکەن بەپێچەوانەی ئەوەی لێیان دووربکەونەوە یا کوڕەکانی خۆیان لەماڵەوە دەربکەن لەو حاڵەتەش لەوانەیە پتر تووشی بەدکاری بن و پتر روو لە بنەماکانی ئایین وەربگێڕن و سوپاس و ستایشی بۆ خوا کە لێم نەگرێت لەوانەیە رۆژێ دابێ بەربەرەکانی ئاینیش بکەن‌و ئەو کاتە باوك ناچار دەبێ روو لە زانایان بکاو لەبارەی نارێکی کوڕەکانی خۆی ئاگاداریان بکاتەوە ئەمانەش هەمووی لەدوای ئەمە دێت کە تەواو لێیان بێزار دەبێت.

الشيخ إبن عثيمين







# لە جگارە کێشان دوور بکەوە

پرسیار: من گەنجێکم هەموو نوێژەکان دەکەم و بەڵام جگارە دەکێشم، دوای ئەوەی جگارەکە دەکێشم هەست دەکەم شتێکی نارێکم کردووە تەوبەی دەکەمو دووبارە دەست بە جگەرەکێشان دەکەمەوەو ئینجا سەر لەنوێ تەوبەی دەکەمەوە ئەمە چەندین جار لەمن روویداوەو ئەم جگارەکێشانەم پێ واز لێناهێندرێت لە سزای خوای گەورە دەترسم پێم بڵێن چی بکەم خوا پاداشتی چاکەتان بداتەوە، تکا دەکەم دوعام بۆ بکەیت بەڵکو واز لەم خووە نەگریسە بهێنم و بێمە ڕیزی چاکەکاری چاکەکاران.

وەڵام: لەخوا داواکارم بۆ وازلێهێنانی پشتگیری بێت و ئێمەش لەگەل تۆ بکاتە چاکەکار. دەڵێم: زۆر هونەرە ئەگەر مرۆڤ بەتایبەتی مرۆڤی موسڵمان لەمەشدا مەبەستم ئەو گەنجە موسڵمانانەیە کە بەڕاستی خوا دەپەرستن و دەیناسن بێ بینەو بەردە، بێ ئەم لاو ئەولا، بێ پسان و گریدان، ئەوەی بەراستی موسڵمانێتی خۆی بکات یەکەمین مەرج بەراستی موسڵمانێتی گەنجان پێویستە خاوەن ورەی بەرز بن، خاوەن بڕوای بەتین بن، توانای تەواویان بەسەر بڕیارەکانی خۆیان هەبێت، وازلێهێنان لە جیگارە شتێکی زۆر ئاسانە بۆ ئەوەی خواو پێغەمبەری (ﷺ) خۆی بەتەواوی بناسێت. برایان خۆتان بەتەواوی رۆشنبیر بکەن و مێژووی خەلیفەکانی راشیدین بخوێننەوە سەیری ژیانو کردەوەکانیان بکەن، ژیانی یاوەرانی پێغەمبەر(ﷺ) بخوێننەوە ئالای ئایینی ئیسلامیان گەیاندە فیلیپینی



ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتی دنیا، لە ڕۆژئاواش لە چیای (برنس)ی ئیسپانیا ئاودیوبوون گەیشتنە ئاقاری شاری پاریسی پایتەختی فەرەنسا، مێژووی ئەم سەرکردانە بە چاکی بخوێننەوە لە ئاستیاندا مرۆڤی ئەم سەردەمە هەست بە کزی‌و لاوازی‌و شەرمەزاری دەکات.

جگارە نەکێشان بۆ کەسێکی ڕۆشنبیر هەر هێندەیە کە بڕیاری بۆ بدا، تۆش بڕیارێک بدە ئەو هێندە جگارەیەی لەنێو پاکەتەکەتدا ماوە بیانشکێنەو چی تر مەکێشە ئەگەر هەر نا لە جیاتی ئەمە شەربەتێک بخۆوەو لەلای پیاو چاکان دانیشە بەڵکو لە بەرانبەریان لە جگارەکێشان هەست بەکەمی و شەرمەزاری خۆت بکەیت، دانیشتنیش لەگەڵ پیاوچاکان خوڕەوشتت چاك دەکات‌و لەگەڵ ئەمەش واز لە جگەرە دێنیت و ڕۆژگارێکیش دادێ هەست دەکەیت لەو سەردەمانەی جگارەت کێشاوە هەڵەی گەورە و زیانی کوشندەشت لە تەندروستی خۆت داوە تەندروستی گەنجی موسڵمانیش زۆر گرنگە چونکە چەند تەمەنت درێژ بێت، خواپەرستی‌و خواناسینت پاشتر دەبێت و، خێرو خێرات زۆرتر دەبێت، چاکەو پیاوەتیش گەورەو جێگیرتر دەبێت.

الشيخ ابن عثيمين



## سزای ئەوەی سوننەتی پێغەمبەر پیڕەو ناکات

پرسیار: هەندێ لە برایان دەڵێن: ئەوەی هەر پێنج کۆڵەکەی ئیسلام جێبەجێ بکات موسڵمانە تاکو ئەگەر سوننەتی پێغەمبەریش (ﷺ) لە سمێڵ تلشینو ریش بەردانەوەو شەرواڵ و عەبا کورتکردن جێبەجێ نەکات، ڕاستی ئەمەمان بۆ ڕوون بکەنەوە خوای گەورە پارێزگارتان بێ؟

وەڵام: ئەمە ڕاستە کە مرۆڤ ئەگەر هەر پێنج کۆڵەکەی ئیسلامی جێبەجێ کرد ئەوە موسڵمانە، تاکو ئەگەر سمێڵی بەرداوەو ریشی خۆی تاشیو جلوبەرگو عەبای شۆڕیشی لەبەرکرد، بەڵکو ئەو کەسە بڕواهێنە بەڵام بڕوای کەموکوڕی تێدایە چونکە سەرپێچی لەم قەدەغەکراوانە دەکاتو لەسەر پێڕەوکردنیشیان ڕشت و مکوڕە، چونکە ئەگەر تۆ گوتت موسڵمان نییە مانای ئەوەیە تۆ لە ئیسلامت دەرهێنا، دەرکردنی مرۆڤیش لە ئیسلام کارێکی ئاسان نییە، بۆ ئێمە ناکرێ کەسێك لە ئیسلام دەربکەین تەنیا بە بەڵگە نەبێ ئەویش لە کتێب( قورئان) و سوننەت هەیەو بڕیاردەری ئەمەش کۆمەڵی نەتەوەی موسڵمانە، چونکە دەرکردن لە ئیسلام سزایەکە لە سزایەکانی خوای گەورە ئەمەش پەیوەستە بەمەسەلە گەورەکان. ئینجا ئێمە کە نەتوانین هیچ شتێ حەڵاڵ بکەین تەنیا بە بەڵگە نەبێ، هەمیشە کە نەتوانین



هیچ شتیێ حەرام بکەین تەنیا بە بەڵگە نەبیێ یا ئەمە پێویستە ئەویش بە بەڵگە، کەواتە ئێمە ناتوانین بڵێین ئەمە کوفرە تەنیا بە بەڵگە نەبێ و ناشتوانین بڵێین ئەمە کافرە ئەویش هەمیشە هەر بە بەڵگە دەبێ نەتەوەی موسڵمانیش هیچ شتێك لێکینەترازاندووە تەنیا نموونەی وەکو ئەم قسانە نەبێ کە لەسەر سەهوو خراپ تێگەیشتن دامەزراوە، دەرچووەکان (الخوارج) لەبەرچی لەژێر ئالآی یەکباوەڕی دەرچوون و شتی زۆریان لە نەتەوەی موسڵمان تێك دا. چونکە ئەوان ئەوەی تاوانێکی گەورەی بکردایە بە کافریان لەقەڵەم دەدداو دەیانگوت: ئەوەی تاوانی گەورە بکا کافرەو هەتا هەتایێ لە نێو ئاگر دەمێنیتەوە پێویستە بکوژرێت، مێژووی ئەو سەردەمیش ئەوانی بۆ ئێمە بەدەرخست کە دەرحەق بەمێژووی پاکی بزووتنەوەی ئایینی ئیسلامی ئەو سەردەم چ ستەمو خراپەکارییەکی گەورەیان کرد، ئەوەی شایانی باسە ئایینی ئیسلام وردەکارییەکی زۆری تێدایە لەهەر شتێکی بچووك یا گەورە کتێبی خواو سوونەتی پێغەمبەر(ﷺ) پێڕەو و پرۆگرامی تەواوی تێدایەو بەوەی موسڵمانی راستی بێت پێویستە لە هێڵی ئایەتە پیرۆزەکان و فەرموودەکان هێندەی کەڵە موویەك لانەدات. کافربوونی مرۆڤی موسڵمان هێندە ئاسان نییە، لەوانەیە







مرۆڤ لە زۆر شتی پرۆگرامی ئاینو سوننەت لابدات بەڵام هەمیشە بڕواهێنەو تەنیا ئەوەیە کە بڕوای کەمی هەیە.

ئەگەر پرسیارم لێکردن مەزنترین شت لە دوژمنداریو ستەم و کوشتاری لەسەر نەوەی ئادەم چییە؟

وەڵامەکە ئەوەیە: کوشتن، کوشتن لە لێسەندنو بردنی ماڵ و سامان مەزنترە، لەبەر ئەمە خوای مەزن بکوژی کردووەتە برای کوژراو. خوای مەزن کە پاشایەو هیچ شتێك نە لە ئاسمان و نە لەزەویو نێوەندییان بەبێ فرمان و ئاگاداری ئەو ناکرێت دەفەرمووێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى ۖ ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ ۚ فَمَنْ عُفِىَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَىْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ البقرە : ١٧٨

واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە، پێویست کراوە لەسەرتان تۆڵە سەندن، لە کوژراواندا (بەیەکسان)، ئازاد بە ئازاد و، بەندە بە بەندەو، ژن بە ژن (مێینە بە مێینە)، ئینجا هەر کەسێك بەخشرا، لەلایەن برایەکی ئایینی یەوە، بە بەشێك (لە خوێنەکە)، دەبێ (خزمەکانی تر) پەیڕەوی بکەن بە باشی.



ئەم ئایەتە بەڵگەی ئەوەیـە کـە خـوای مـەزن بکـوژو کـوژراوی موسڵمانانی بە برای یەکدی داناوە.

هەروەها خوای مـەزن لـە شـەڕی نێـوان دوو هـۆز لـە ئیمانـداران دەفەرمووێ:

﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَـٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ...... ﴿١٠﴾ ﴾ الحجرات: ٩-١٠

واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵ لە ئیمانداران، دژ بەیەکتر جـەنگیان کـرد، ئەوە لەنێوانیاندا ئاشتەوایی بکەن، ئەنجا ئـەگـەر کۆمـەڵێکیان دەسـت درێژی کرد، بۆ سەر کۆمەڵێکی تریان، ئەوە ئێوە (موسڵمانان) لەگـەڵ ئەوەیان بجەنگن کە دەست درێژی دەکات، تا دەگەڕێتەوە، بۆ فـەرمانی خوا( ملکەچی فەرمانی خوا دەبێ)، ئینجا ئەگەر گەڕایـەوە، ئەوسـا لە نێوانیاندا ئاشتەواویی بکەن، بەدادگەرانەو راست و دادپەروەر بن(لە نێوانیاندا). بێگومان خوا، دادپەروەرانی خـۆش دەوێـت، بـێ گومـان تەنیا باوەڕداران بران، کەواتە ئەگەر لەنێوان دووبراتاندا(ئاژاوە هەبوو) ئاشتەوایی بکەن و، لەخوا بترسن، تا بەزەییتان پێ بکات.



ئێستا ئەمە ئێوە بەخۆتان دەبینن لە فەرموودەی خوای مەزندا کە بە خۆی داهێنەرو دانەرو دروستکەرەو هەر بەخۆیشی بەسۆزو میهرەبانە بکوژی کردووەتە برای کوژراوو، بکوژیش لە بڕوای خۆی بەخوای گەورە دەرناچێت و بکوژی ئیماندارانیش لە ئیمانو بڕوابوون بە خواو پێغەمبەر (ﷺ) دەرناچێت.

کەواتە چۆن ئەگەر یەکێك ریشی خۆی تاشی‌و، جلوبەرگ و پانتۆڵ و شەروالی خۆی شۆڕ کرد چۆن دەتوانین بڵێین ئەمە موسڵمان نییە؟ دەڵێین ئەو کەسە موسڵمانەو بەڵام کەم باوەرە لەگەڵ ئەوەی لە زۆر شتیش یاخییە.

الشيخ إبن عثيمين



## ڕێگای تەوبەکردن

پرسیار: شێخی بەڕێز: من گـەنجێکم دەمـەوێت تەوبـە بکـەم خـوا دەزانی من کە بۆ هەر کۆڕێکی ئایینی دەچم تەنیا ئەوەیـە لـە ئـایین قووڵ ببمـەوەو سـەرجەم ئامۆژگـاریو ڕێنماییـەکانی پیـاوانی زانـاو چاکەکاران لە گوێ بگرم و بەپێی توانا پەیڕەویان بکەمو، بەڵام ئـەوەی سەیری ئەم سەردەمە دەکەم کە خودی خۆم وای بـۆ دەچـم تاڕادەیـەك حەز دەکەم لەگەڵیدا بڕۆم ئەویش ئەوەیە کە ریشم دەتاشم جلوبـەرگی جوانو گرانبەهای شۆڕ لەبەردەکەم و لەماڵیـشمان خـۆم لەبـەر دۆش دەشۆرم چارەی من چیە؟ داوا لە خوای گەورە دەکەم لەسـەر دەسـت و ڕێنماییەکانی تۆ بۆمنو برایانی موسڵمان کە وەکـو مـن کەوتوونەتـە نێو شێوەی ئەم نموونانە بتوانم لە وەڵامێکی چاك و دروسـتی بـەڕێزتان ڕێگای ڕاستی بدۆزمەوە؟

وەڵام: لەخوای گەورە داواکارم ڕێگای ڕاستی بگرێت، ئەی خودایە داواکارم ڕێگای ڕووناکی پیـشان بـدەیت و ئاسـانکاری بـۆ بکـەیت. بێگومان ئەم پرسیارە مەبەستی خۆی هەیەو لە خوای مەزن داواکـارم کە بەخێرو چاکە مزگێنی وەرگریت چونکە ئەمە نیازو مەبەستتە.

تەوبـەکردنیش ئاسـانە ئەگـەر دڵ و دەروون نیازپـاکی تێـدابێت و هەڵبەتە بۆ ئـەم مەبەسـتەش خـوای گـەورە بـەگوێرەی دڵـی گـەنجی



موسڵمان دەداو ئاسانکاری دەکات، یەکەمین شت ئەوەیـە کـە ئێـستا بچیت دۆشەکە بشکێنیت، ئەگەرچی لەم شکانە زۆر زیانی لێدەکـەوێ بەڵام خوای گەورە لە پاشان پاداشتی دەداتەوە چونکە شکاندنەکە بـۆ خوا بووە.

دەربارەی ریش تاشین و جلوبەرگی جوانو شۆڕ شێوازێکی لە کلتـور هەیەو ئایینی ئیسلامیش کلتوری خۆی ماوەی ١٤٠ ساڵە پاراستووە ئەمــە کلتــووری ئێمەیــەو شــانازی پێــوە دەکــەین کــە ســوونەتی پێغەمبەرە(ﷺ) بەم برایەشم دەڵێم: سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە کە ئەم پرسیارەت کـردو بـەڵکو ئـەم وەڵامــەی ئێمـە بـۆ تـۆ ببێتـە مەشخەڵی روونـاکیو دڵ و دەروونـت بـە پەرسـتنی خـواو سـوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) جۆش بدرێ. یەکەمین شت ئەوەیە کە ئێـستا بـچیت بە هاوکاری خـوای گـەورە دوشـەکە بـشکێنیت بـەڵام جـل و بەرگـە شۆڕەکە هیچ لەمە ئاسانتر نییە کە خۆت لە گوناهبارییەکـەی رزگـار بکەیت، ریش تاشینەکەش زۆر بە ئاسانی چارەی دەکـرێ ئەگـەر هـەر نەیتراشیت و لێی بگەڕێیت پانو بەرین و درێژ بێت و لە خوای گەورە داوا بکەیت و لێی بپاڕێیتەوە تاکو وەڵام بدرێیتەوە کە پەیمانت لەگـەڵ خوای مــەزن بــەردەوام و چەسـپاو بێــت و ئاگـاداری ئـەوەش بیـت یاوەری چاکەکاران بکەیت و یارمەتی برایانی موسـڵمان بـدەیت و لـە



ئامادەبوون و گوێگرتن لە کۆڕە ئایینییەکان درێغی نەکەیت. لەخوای مەزن داواکارم ڕێگای بڕوای ڕاستی بگرێت و لادانی گەورەی لێنەکات و ئەم وەڵامە بۆ ئەو پڕ بە پێستی بێت و ئامۆژگاری و ڕێنماییەکان بە چاکی جێبەجێ بکات و خوای گەورەش هاوکارو ئاسانکاری بێت.







## گەنجێك ئەركەكانی ئاینیش جێبەجێ دەكات و كردەوەی خراپیش دەكات

پرسیار: گەنجێك هەر پێنج كۆڵەكەكانی ئیسلام جێبەجێ دەكات وەكو ئەوەی شەرعی خوا بۆی داناوە بەڵام هەندێ كردەوەی خراپ دەكات كە كیتابی خواو سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) نەهی لێكردووە حوكمی ئیسلام لەمەدا چییە؟

وەڵام: دەرگای تەوبە واڵایە تاكو ئەو كاتەی خۆر لە رۆژئاواكانییەوە هەڵدێ. لەسەر هەموو كافرێك یا یاخی بووییێك پێویستە بەرانبەر خوای گەورە تەوبەی ئیجگاری بكات، لە ترسی خواو مەزنێتی و شكۆداری دەبێ واز لە مانە بهێنێ، واز لەهەموو كردەوەیەكی خراپی رۆژانی پێشوو بهێنێت و نیازپاكی خۆی بەدیار بخات و لەگەڵ خوای مەزن پەیمان ببەستێ و جارێكی دی نەگەڕێتەوە، كردەوەی ئابڕووبەر دووبارە نەكاتەوە، ئەوەی دین لاواز دەكات لێی نزیك نەبێتەوە، لە یارمەتی ئامادەبێت، لە بەهاناهاتنی كارەساتەكانی موسڵمانان رابەر بێت و بیرو هەستی هەموو دەمێكی لەسەر باس و خواسی برایانی موسڵمانان و نەتەوەی موسڵمان بێت، ئەمەش نیازو بڕیاری بەتوانای دەوێ كە جارێكی دی ئەركی كەسێكی موسڵمان پشتگوێ نەخات، كەی بەندەش ئەم تەوبەیەی كرد خوای گەورە لە سەرجەم خراپەكارییەكانی پێشووی خۆش دەبێت.



خوای گەورە کە مرۆڤی لە نەبوونەوە دروست کردووە، لەگەڵ دروستکردنەکەشدا مێشکی داوەتێ، تاکو بەخۆی پێویستی خۆی دروست بکات، کەواتە مێشکی مرۆڤ پۆپەی داهێنانی خوای گەورەیە.. ئەم داهێنانە، داهێنانێکە ئەوپەڕی گەورەیی و مەزنێتی و توانای خوا پیشان دەدات کە مرۆڤ مێشکی خۆی بەکاربهێنێت تاکو خوای تاك و تەنیای خۆی بەچاکی بناسێت... بیپەرستێت و هەموو دەمێك کڕنۆشی بۆ بەرێت، دەفەرموێت:

﴿ ......وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ النور: ٣١.

واتە: هەمووتان تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەی ئیماندارەکان، تا رزگارو سەرکەوتووبن.

شایستەی سوپاس و ستایش دەفەرموێت:

﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ﴾ طه: ٨٢.

واتە: وە بەڕاستی من زۆر لێبووردووم لەو کەسەی تەوبەی کردبێ، وە باوەری هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێت، پاشان بەردەوام بووبێ لەسەر ئەو رێبازە.







پێغەمبەر فەرمووی: ئیسلام ئەوەی پێش خۆی دەڕمێنێت و بەلاوەی دەنێت و تەوبەش ئەوەی پێش خۆی دەڕمێنێت و بەلاوەی دەنێت.

ئەو موسڵمانەی تەوبەی تەواو دەکات مافی لەسەر هەیە: ستەمی لەهەر کەسێك کردبوو دەبێ ستەمەکە هەڵگرێ یا حەڵاڵی بکا وەکو ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت:

هەر کەسێك ستەمێکی لەلای برایەکی خۆی هەبوو با هەر ئێستا هەڵیبگرێ بەر لەوەی گەورە بێت، ئەگەر نا لە کردەوە چاکەکانی بە گوێرەی ستەمەکە لێی هەڵدەیگرێ، ئەگەر کردەوەی چاکیشی نەبوو لە کردەوەی خراپەکانی ستەملێکراوەکە هەڵدەگیرێت و دەخرێتە سەر ئەستۆی ئەو. (رواه البخاري)

ئایەت و فەرموودە لەبارەی ئەمە زۆرن.

الشيخ إبن باز



## پاساو هێنانەوە بۆ ئایەتەکانی خودا

پرسیار: چ دەڵێن بەوەی بە فەرموودەی خوای گەورە پاساو دێنیتەوە (إن الله غفور رحيم) بە واتای خوای گەورە لێبووردەی بە سۆزە، لە گوناهەکان خۆش دەبێت؟

وەڵام: ئەگەر بۆ کردەوە خراپەکان ئەوەی بە پاساو هێنایەوە بەڵگەی ئێمەش بۆ سزای کردەوە خراپەکان ئەوەیە کە خوای میهرەبان دەفەرمووێت:

﴿ ۞ نَبِّئْ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ﴿٥٠﴾ ﴾ الحجر -٤٩-٥٠.

واتە: هەواڵ بدە بە بەندەکانم، کە بەڕاستی هەر من لێبووردەی میهرەبانم و، بێگومان هەر سزای منە سزای سەخت. وە لەفەرموودەی خوای مەزن:

﴿ ٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩٨﴾ ﴾ المائدە: ٩٨

واتە: باش بزانن کە بەڕاستی خوا تۆڵەی زۆر بە تێنە(بۆ یاخییان)، وە بەڕاستی خوا لێبووردەی میهرەبانە( بۆ تەوبەکاران).

ئێنجا هەندێ کەس ئەگەر ئایەتێکی وا توندی بۆ نموونە بهێنیتەوە سەیر دەکەیت لەلایەکی دی نموونەی ئایەتێکی نەرمت، بۆ دێنێتەوە، ئەمانە وەڵامی ئەو کەسانەن کە لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی سەر



شانی کەسی موسڵمان درێغی دەکەن، یا کەمتەرخەمی دەکەن، یا ئەوەتا تەمەبەڵی دەکەن یا ئەوەتا بەڕاستی بڵێین موسڵمانن بەڵام موسڵمانی بڕوا لاواز.

ئێمەش پێی دەڵێین خوای گەورە بەچاکی بپەرستە، خوای مەزن شتە جوانەکانی مرۆڤی خۆش دەوێت وەکو ئەو کارو کردەوانە کە لە ژیانی ڕۆژانەدا سوود بە مرۆڤایەتی دەگەیەنن، کۆمەڵ پێی هۆشیار دەبێتەوەو چاکتر لە خوای خۆی دەگات و کار بۆ پێشخستنی کۆمەڵ دەکات، شتە ناشیرینەکانیش ئەمانەن کە کۆمەڵی ئیسلامی نەفرەتیان لێدەکات. خوای گەورە لێبووردەیەو چاو لە کردەوە ناشیرینەکانی بەندەی خۆی دەپۆشێت و لەهەمان کاتیشدا هیچ سزایەك لە دنیادا نییە بگاتە ئێش وئازاری سزای خودا کە ئێش وئازارێکە کۆتایی نییە.

برای ئازیز: ئەوەی خوای گەورە لەسەر تۆ پێویستی کردووە هەوڵ بدە بە تەواوی جێبەجێیان بکەیت، ئەوەش بزانە هەموو کەس ئەوەی خوای مەزن لەسەری پێویست کردووە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست هەموو ئەرکەکانی پێ جێبەجێ ناکرێت.

الشيخ إبن باز



# گەنجێکی تەوبەکار پرسیار دەکات

پرسیار: مرۆڤێك لە سەردەمی گەنجایەتی خۆی هەندێ گوناهی گەورەی کردووەو شایانی ئەوەیە لەلایەن خوای مەزن نەفرەت بکرێت، کەچی ئێستا تەوبەی کردووەو چەند خاڵێکی هەیە دەیەوێت لێیان بکۆڵێتەوە:

١- ترسی لەوەیە سزای گوناهەکانی تووش بێت تاکو ئەگەر ماوەشی بەسەر بچێت.

٢- ترسی لەوەیە کار لە تەوبەکەی بکاتو ڕشت و چەسپاوییەکەی لەسەر خواپەرستی لەق بکات.

٣- ئایا لەسەر ئەم کردەوانە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت سەرەڕای ئەوەی لەسەر ئەم کردەوانەش تەوبەی کردووە؟

٤- ئایا نەفرەت لێدان لەم سات و وەختەیە کە کردەوە خراپەکە دەکات؟

٥- ئەم کردەوە خراپانە کە بە نەزانیو نەفامی دەکرێ و سزاکەی نازاندرێ ئایا مرۆڤ کە لە سزاکەی نەفامە لێی دەبووردرێ سەرەڕای ئەوەی کە بەنهێنیش دەیکات؟

وەڵام: پێویستە پرسیارکار و ئەوانی دیکەش ئەوە بزانن کە هەر کەسێك لەسەر گوناهێك کە دەیکا تەوبەی بکات خوای گەورە بە



تەوبەکە قایـل دەبـی و لێـی وەردەگیرێـت، تـاکو ئەگـەر گوناهەکـە گەورەش بێت، خوای مـەزن دەفەرمووێت:

﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمـــر: ٥٣.

واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ ئەی بەنـدەکانم ئـەی ئەوانـەی کـە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە، نائومێد مەبن لە میهرەبـانیو بـەزەیی خوا، چونکە بێگومـان خـوا لەهـەموو گوناهـەکانتان خـۆش دەبێـت، بەڕاستی هەر ئەوە لێبووردەی بە بەزەیی یە.

ئەمەش بۆ تەویەکارانە خوای میهرەبان فەرمووی:

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَـٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَـٰلِحًا فَأُو۟لَـٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَـٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان: ٦٨-٦٩-٧٠.



واته: وه کەسانێکن که لەگەڵ خوادا ناپەرستن، هیچ پەرستراوێکی تر، و ناکوژن، هیچ کەسێ که خوا کوشتنی ئەوی یاساغ (حەرام) کردووه، به حەق و ڕەوا نەبێ، وه زیناو داوێن پیسی ناکەن، وه هەر کەس ئەو تاوانانه بکات (کەباسکران) تووشی تۆڵەکەی دێت، سزای بۆ چەند باره دەکرێتەوه، لە ڕۆژی قیامەتداو، بێ بڕانەوه بەبێ ڕێزو رسوایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوه، بێجگە لە کەسێ تەوبەی کردبێ و باوەڕی هێنابێ، کاروکردەوەی چاکیشی کردبێت، ئا ئەوانە، خوای گەوره خراپەو تاوانەکانیان دەگۆڕێت بە چاکە، وه خوا هەمیشه لێبووردەی به بەزەیی یه.

ئەم فەرموودەیەش لە پێغەمبەرەوه (ﷺ) هاتووه که دەفەرمووێت:

﴿تەوبه کردن ئەوەی پێش خۆی دەڕمێنێت و دەیسڕێتەوه﴾ لە سەرگوزەشتەی پیاوێك که پێش سەردەمی ئێمە بووه دەگێڕنەوه دەڵێن نەوەت و نۆ کەسی کوشتبوو لە بەندەیەکی پرسی: ئایا ئەمە تەوبەی لەسەر دەکرێ؟ ئەویش گوتی: نازانم بۆ تۆ تەوبە هەبێ، ئەویشی کوشت و سەدی تەواو کرد، لە زانایەکیشی پرسی و ئەویش پێ گوت: کێ هەیە نێوان تۆو تەوبەکردن بگرێ و، بەڵام لادێیەکی پێ نیشاندا خەڵکەکەی باش و چاکەکار بوونو فرمانی پێ دا که بۆ ئەوێ کۆچ بکاتو کاتێ بەڕێوەبوو مردنی گەیشتێ فریشتەکانی بەزەییو







فریشتەکانی سزاو ئازار ناکۆکییان کەوتە نێوان، خوای مەزن فریشتەیەکی بۆ ڕەوانە کردن تاکو نێوانیان یەکلابکاتەوەو گوتیشی: نێوان هەردوو لادێیەکان بپێون لە کامەیان نزیك بوو خەڵکی ئەوێیە. پێوایان سەیریان کرد ئەم پیاوە خەڵکی گوندەکەی چاکەکارەکانە. بۆ ئەمەش فریشتەی بەزەیی بۆ خۆی برد.

ئەو پیاوەی کە باسی کردووە کردەوەی خراپی کردووەو شایانی نەفرەتی خوای گەورەیەو بەڵام تەوبەی کرد وازی لە هەموو شتێکی بەدو بەدکاری هێنا.

پێی دەڵێم: مزگێنیت دەدەمێ کە ئەمە گزنگی ڕووناکی خێرو چاکەکارییە چونکە خوای گەورە ئەگەر زانی کە تۆ تەوبەی ئێجگاری دەکەیت ئەوە لەهەموو گوناهەکانت خۆش دەبێت وەکو ئەوەیە کە تازە لەدایکبوبیت وەکو بەسۆزو میهرەبان دەفەرموێت:

﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧﴾ ﴾ النساء: ١٧

واتە: بێگومان وەرگرتنی تەوبە، لای خوا تەنیا بۆ ئەوانەیە کە بە نەفامی گوناه دەکەن، پاشان پەشیمان دەبنەوە، بەزوویی (پێش







مردن)، ئا ئەوانە، خوا گەڕانەوەیان لیّ وەردەگریّت، خـواش هەمیـشە زانای دانایە.

مەبەست لـەم فەرموودەیـە: ﴿ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ﴾ مەبەسـت پیّش مردنە، بەڵگەش لە فەرموودەکەی دوایی دیّت:

﴿وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّى تُبْتُ ٱلْـَٔـٰنَ﴾ النساء: ١٨

واتە: تەوبەش وەرناگیریّ، بۆ ئەوانەی زۆر تاوان دەکەن، هەتا کاتیّ سەرەمەرگی یەکیّکیان دیّ، دەڵیّت:

بەڕاستی من ئیّستا تەوبەم کرد.

با لە تەوبەی خۆی ڕشت و بەردەوام بیّت و نەگریس ڕاڕایی نەخاتە نیّو دڵییەوە بەوەی دوودڵی بخاتـە میّـشکییەوە کـە گوایـە تەوبەکـەی جیّی خۆی نەگرتووەو خوای گـەورە پیّـی قایـل نـەبووەو لەسـەر ئـەو مافانەی بۆ خاوەنەکانیان بگەڕیّنیّتەوە یا سەرجەم مافـەکانی حـەلاڵ بکـات ئەگـەر خـاوەن مافەکانیـشی نەدۆزییـەوەو هـەروەها کـەس و کاریشیانی نەدۆزییەوە یا ئەگەر مردوو بووبن ئەو کاتـە تـەواوی بـڕی ئەو مافانە پیّویستە خیّر بکات تاکو لیّی ڕزگار بیّت و تەوبەکـەی لـیّ وەربگیریّت.







نموونەی ئەمە: ئەگەر گوناهی ئەو کەسە ماڵ و سامانی کەسێکی دی خواردبێ، یا دزیبێ، یا بەزۆرە ملێ لێی سەندبێ و ئینجا تەوبەی کردێ، ئەمە ئەو کەسە پێویستە لەسەری ئەم ماڵ و سامانە بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە ئەگەر زیندوو بوو، ئەگەر مردوو بوو بۆ وارسەکەی بگەڕێنێتەوە، ئەگەر خاوەنەکەشی نەدۆزییەوە، پێویستە بڕی ئەو ماڵ و سامانەی لەلای ماوە بیکاتە خێرو بیبەخشێت، خێرو بەخشینەکەش دەبێ بە ناوی خاوەن ماڵ و سامانەکە بێ بە مانای خێرەکە نیازی ئەوەی لێبکرێ کە بۆ خاوەنی ماڵ و سامانەکەبێ.

خوای گەورەش هەر بەخۆی زانای دانایە خێرەکە دەگەیێنێتەوە خاوەنی خۆی.

بەڵام قسەکەی: کە دەترسێ گوناهەکانی کار لە تەوبەکەی بکەن.

هیچ ترسێك نییە، چونکە هەموو گوناهەکان چ گەورەو چ گچکە بە تەوبەکردن هەموو دەڕوخێندرێ و تەواو دەسڕێنەوە. بەرەها کاریگەری نامێنێت. لەوانەش مرۆڤ دوای تەوبە بە تەواوی بگۆڕێت و خێرو خێراتی لەدەست بێ و دڵ و دەروونی بگۆڕێت پتر بەزەیی بە خەڵکی هەژارو برسی بێتەوەو یارمەتی لێقەوماوان بدات و لەهەر کارەساتێکی



سروشتی که خەڵکی موسڵمان تووشی دێ لە بەهانا هاتنیان پێشبڕکێ بکات.

لەوانەش ئەم تەوبەکارە بەم کـاروکردەوە چـاك و خێرخوازییانـە لـە پەنای خۆی دەگرێـت و لـەدەردو بـەلای دنیـا دەپیارێزێـت و ئەمـەش نیشانەیەکە لەنیشانەکانی چاکەکاران و چاکەکارانیش هەڵبەتە پلەیەك لە ئاستی پلەی کەسانی ئاسایی لەخوای گەورە نزیکن.

سـەیری فـەرموودەی خـوای گـەورە بکـە کـە دەربـارەی ئـادەم دەفەرموویت:

﴿ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَاتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ ﴾ طه ١٢١-١٢٢

واتە:

وە ئادەم سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کـرد، ئـیتر لـە رێگـای راست لای دا، پاشان پەروەردگار هەڵی بژارد( بـۆ پێغەمبەرایـەتی) و تەوبەی لێ قبووڵ کردو رێنموونی کرد.

بەڵام دەربارەی قسەکەی: ئایا نەفرەتەکە لـەکاتی جێبـەجێ کردنـی کارە خراپەکە روودەدات.







بۆ ئەمەش دەڵێین: لەوانەیە لەکاتی جێبەجێکردنی کارە خراپەکە تووشی نەفرەت لێدان بێت تووشی شکستییەکی ئێجگار گەورە بێتەوە، لەوانەشە دواتر بەشتێکی دی سزا بدرێت ئەمەش خوای گەورە هەر بەخۆی تواناداره‌و هەر بەخۆیشی زانای دانایەو سزاو پاداشت هەمیشە بەدەست خۆیەتی و زۆر جاریش کە ستەمی زۆر ئەستوور دەکرێ ستەمەکە لە ئەستۆی ستەمکار دەمینێتەوەو لە رۆژی زیندووبوونەوە لێپرسینەوەی وردو توندی لەگەڵ دەکرێت و ئەو کاتەش کاتێکە لە پەشیمانبوونەوەو گەڕانەوەی تێدا نییە، لەم سەردەمەش کە سەردەمی عەولەمەیە، عەولەمەش چەشنی چادرێکی گەورەیە گۆی زەوی و هەموو دنیای بەجیهانی ئیسلامییەوە داپۆشیوەو لە شێوەی گوندێکی بچووکی لێ کردووە. گەنجانی موسڵمانمان لە هەر کوێیەك بن، چ لە ماڵ، یا لە دەرەوە، یا لەنێو بازاڕ، یا لەهەر سوچێك بن، بە پێلوو بەرزکردنەوەیەك تووشی هەزارەها گوناه دەبنەوە. ئەی خودایە لێمان نەگریت بە کردەوەی خۆمانمان لەگەڵ نەکەیت، لەم دنیایە جەنجاڵە بمانپارێزیت وەکو ئەوەی تۆی گەورەو شکۆمەند، تۆی زانای دانا تەواو دەپەرستین و تەواویش دەناسین.

بێگومان ئەوەی تەوبەی راستیش بکات بەمانای تەوبەی ئێجگاری دەکەوێتە بەر بەزەیی‌و میهرەبانی خوای مەزن.






بەڵام دەربارەی قسەکەی: ئەگەر ئەو کەسە نەخوێندەوارو نەزان بـوو و بە سزای ئەم شتانەی نەزانی.

ئەم برایە دەڵێم هەموو کۆمەڵێك لەهەر کۆمەڵگەیەکی سەر رووی دنیا دابونەریتی تایبەتی خۆی هەیە، ئینجا هەر کۆمەڵگەیـەکیش بـۆ نموونە وەردەگریت بەپێی ئایینی خۆی شتی رێپێدراوو شـتی یاسـاغی هەیە، هەموو کەسێك هەر چەند نەخوێندەوارو نەزان بێت بـە گـوێرەی دابونەریتی دەوربەری خۆی دەجولێتەوە، ئینجا سەردەمانێکی زۆریشە خەڵك شتی راست و ناڕاست لەیەکدی جیا دەکەنەوە... کۆمەڵگەکانی پێش ئیسلامیش ئەوانیش شتی رێپدارو و شتی یاسـاغیان وەکـو یاسـا زانیوەو ئەزموونیان لەسەر هەبووە. ئیدی ئەو خەڵکەی پێش سەد ساڵ کە بەگشتی نەخوێندەوار بوون چۆن خۆیان لە شتە یاساغ و حەڕامەکان پاراستووە.... هەموو کەسێك تاکو ئەگەر ئەلف و بێـی خوێندنیـشی نەخوێندبێ کردەوەی چاك و خراپ لەیەکدی جیادەکاتەوەو کەواتـە کـە دەزانێ حەڕامەو دەشیکا ئەمـە سـزای لەسـەرە لـەدنیا یـا لـە رۆژی قیامەت، ئینجا ئەگەر مرۆڤ لەدڵی خۆیدا بڵێ ئەگەر دەمزانـی ئەمـە سزای لەسەرە نەمدەکرد. ئەمە هەرگیز پاساو نییە. چونکە ئـەم شـتە حەڕامە، یابەدە، یا قەدەغـەکراوە هـەم لـە ئـایین نـەفرەت لێکـراوەو هەمیش لە شەرعی دنیا قەدەغەیە، ئەمە دەکاو بەدڵنیاییش دەزانێت



کارەکە حەڕامە ئەمە سزای خۆی لەسەرەو ئەگەر لەدنیاش کەس پێی نەزانی لەلای خوای گەورە کە لە ڕۆژی زیندوو بوونەوە لەبەردەم دادگای خوای مەزن دەوەستێت سزای توند دەدرێت.

بۆیە ئەگەر کەسێك زینای کردو بەخۆیشی دەزانێ زینا کردن حەڕامە، چونکە بڕوا ناکەم هیچ کەسێك هەرچەند نەزان و نەخوێندەوار بێت نەزانێت زیناکردن حەڕامە، لە وەتەی ئادەمیزاد هەبووەو دنیا دامەزراوە لەهەموو ئاینێك زیناکردن قەدەغەو حەڕام بووە، جا ئەگەر لەمە نەزانو نەفام بی دەبێ ئەوە بزانێت زیناکار ڕەجم دەکرێت بەمانای بەردباران دەکرێت تاکو دەمرێت، زیناکاریش لەوانەیە بەخەیاڵیدا نەبێت کە بەردباران بکرێت، لێرە بەردباران دەکرێت ئەگەرچی بە سزای بەردبارانکردنی خۆیشی نازانێت.

هەروەها ئەگەر کەسێك لە ڕۆژی ڕەمەزان بەڕۆژووەو، بە ڕۆژ لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆی جووت بووە، ئینجا گوتی:

من نازانم کەفارەدانی جووت بوون هێندە زۆرە، کە دەکاتە گەردن ئازادکردنی کۆیلەیەك، ئەگەر نەیتوانی دەبێ شەست هەژار بەخۆراکی چاك تێربکات ئینجا ئەم نەزانینە بە کەفارەدان نەوە لانابات کە تۆ کەفارەدانت لەسەر پێویست دەبێت، ئەمە لەسەرت فەرز دەبێت تاکو ئەگەر سزاکەشت نەزانیبێت. بەڵگەی ئەمەش ئەو پیاوەی کە دەربارەی



جووت بوونی لەگەڵ هاوسەری خۆی لەڕۆژی ڕەمەزان کە چ لەسەری پێویستە بیکەم؟ لە پێغەمبەری (ﷺ) پرسی، پێغەمبەریش (ﷺ) فەتوای بۆ دا: کۆیلەیەك، یا دیلێك ئازاد بکە، ئەگەر بە چنگ نەکەوت، دوو مانگ یەك لەدوای یەك بەڕۆژوو ببە، ئەگەر نەتتوانی، شەست هەژار نان بدە، گرنگ ئەوەیە هیچ کەس نییە کە کارێکی خراپ بکات، چ لەڕووی شەرعی دنیایی، یا لە ڕووی شەرعی خوایی، نەزانێت سزای بەدوایەوەیە.

الشيخ إبن عثيمين



## ئایا تەوبەکار نوێژو ڕۆژووەکان جێبەجێ دەکات

پرسیار: شێخی بەڕێزمان چی دەڵێ: دەربارەی ئەو کەسەی کەبەئەنقەست نوێژ ناکات و بەرۆژوو نابێت، ئینجا دوای ئەوەی خوای مەزن دەرگای ڕووناکی بۆ والاّ کردو، تەوبەی کردو، لەسەر تەمەنی لاوێتی خۆی، کە بەهیچ و خۆرایی و نیمچە بەڕەڵاییەك بەسەربرد، گریاو دەستی بە نوێژو ڕۆژوو بوونان کردوە، پێڕەوی سەرجەم پرۆگرامەکانی ئایین و سوننەتەکانی پێغەمبەری(ﷺ) کرد، ئایا پێویستە (فەرزە) کە نوێژو ڕۆژووبوونەکان جێبەجێ بکات، یا هەر تەوبەکردنەکە بەسەو لە جیاتی نوێژو ڕۆژووەکانە؟

وەلاّم: ئەوەی واز لە نوێژو ڕۆژووەکان دێنێ و ئینجا تەوبەی ئێجگاری دەکات بەڕەها جێی نوێژو ڕۆژووەکان ناگرێتەوە، چونکە وازلێهێنان لە نوێژ کوفرێکی گەورەیەو، لە ڕێبازی ئایین دەردەچێ، ئینجا ئەگەر ئەوەی وازی لە نوێژ و ڕۆژووەکان هێناوە لەبێ باوەڕی و، دانپیانەنانو، نکۆڵ کردنو، کفرو، لە ئایین دەرچوونەکەی خۆی نەگەڕێتەوە، بڕیاری زانایانی ئایینی لەسەر جێبەجێ دەکرێت، خوای گەورەش لە ئاستی داواکاری بەندەیەکی کەساس و زەبوون و بێ دەسەلاّت شەرم دەکات ئەگەر داواکارییەکەی یەکسەر جێبەجێ نەکات بۆیە خودای گەورە لەهەموو سۆزدارێك بەسۆزترەو دەفەرموێت:



﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ الأنفال:٣٦.

واته: ئەي موحەممەد (ﷺ) بڵێ: بە ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون، ئەگەر کۆتایی بهێنن(بەبێ بڕواییەکەیان)، بەڕاستی (خوا) دەبووری لەهەرچی لەوەوپێش کردوویانە.

نێرراوی خوا موحەممەد(ﷺ) دەفەرموویێت:

(ئیسلامبوون هەرچی لەوەوپێش کراوە دەیڕمێنێت و دەیسڕێتەوە، تەوبەکردنیش ئەوەی پێشوو نەکراوە پێوست دەکات، بەمانای سەرجەم فەرزەکانی ئایین بەبێ کەموکوڕی بەبێ فەرامۆشکردنی هیچ یەکێکیان پێویستە هەموویان وەکو (فەرز) جێبەجێ بکرێن. (مەبەست دوای تەوبەکردنە)بۆ ئەم مەسەلەیە بەڵگە زۆرە.

هەر لەم بارەیەوە خوای مەزن دەفەرموویێت:

﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ﴾ طه:٨٢.







واتە: وە بەڕاستی من زۆر لێبووردووم لەو کەسەی تەوبەی کردبێ، وە باوەری هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێت، پاشان بەردەوام بووبێ لەسەر ئەم ڕێبازە.

خوای گەورە لە ئاستی بیرولێکدانەوەی مرۆڤ بەڕەها گەورەترە، کە مرۆڤ دروستکەری دەستی خودای گەورە بێت و لە نهێنییەکانی خودای خۆشەویست بگات، ئەم گەردوونە هەر کە سەیری دەکەیت عەقڵی مرۆڤ لە ئاستی گەورەیی بۆشایی ئاسمان تەنیا خواپەرستن و کڕنۆش بردنە، کە دامەزرێنەرو داهێنەرو هەڵسووڕێنەری ئەم ئاسمانە بێ سەرو بێ بنەبێ، ئەم ئاسمانە بێ ئاسۆو بێ پەرژینەبێ، هیچ شتێك تێیدا نییە لە ڕاوەستان بێت هەمووی دەجوولێتەوە، دەخولێتەوە، خودای گەورە لەیەك سات و زەمەندا لەهەموو شتێك ئاگادارە، لەوەی نەبووەو لەوەی دەبێ، لە زیندوو و لە مردووان بەگەورەیی خۆی دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ..... ﴾ التحريم: ٨.

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بە گەڕانەوەیەکی ئێجگاری، تا پەووەردگارتان لە گوناهەکانتان خۆش



ببێ، وه بتانخاته ناو باخاتێکەوه، کە دەڕوا بـه ژێریانـدا جۆگـه ئـاوی زۆر.

هەمیـــشه بـــۆ ئـــەم مەبەســـتەش پێغەمبـــەری مـــەزن (ﷺ) دەفەرمووێت:

(تەوبەکار لە گوناهەکان، وەکو ئەوەیە هیچ گوناهی نییە).

ئەوەی بۆ خـوا تەوبـەی ئێجگـاری دەکـات (توبـة النـصوح) پـێش هەموو شـتێك پێویـستە خـۆی فێـری قورئـان خوێندنـەوه بکـات و، سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) پێڕەو بکات و، خودی خۆی تـەواو ڕۆشـنبیر بکات و، لە کۆڕی ئایینی ئامادەو گوێڕایەڵ بێت و، بەرانبەر نـەزان و نـەفام و لـە ڕێدەرچـوان بـەدەموزار بێـت و ڕێنیـشاندەر بێـت و، چاکەکارو هێمن و هۆشیارو بەسۆز بێت و، ئەوەی ئـایین لاواز دەکـات لێی دوور بکەوێتەوەو، دەمی خۆی بەبێ سـوپاس و ستایـشی خـوای گـەورە نەکاتـەوەو، لەمامەڵـەی بازرگـانی کـە زۆربـەی ئیمانـداران بەنەزانی تێی دەکەون پێویستە ڕاستگۆ بێت و، سوێند بەدرۆ نـەخوات و، دادەورو مافپەروەر بێت و، لەکاری خێرخوازی بەپێی توانـا بەشـدار بێت و، بۆ بەهانا هاتن و یارمەتیدانی کارەساتەکانی سـەر نەتـەوەی موســڵمان پێویــستە هــەموو جارێــك ئامادەبێــت، کورتــەی ئــەم مەسەلەیەش برایانی موسڵمان ئەوەیە کە تەوبەکردنی ئێجگـاری زۆر



زەحمەتە بەڵام ئەگەر نیازی لێبهێنێ‌و بڕیاری بۆ بدەیت، ئاسانەو، خوای گەورەش ئاسانکاریت بۆ دەکات.

لە کۆتاییدا داواکارم لە خوای گەورە بە سەرجەم تەوبەی تەوبەکاران قایل بێت، سوپاس و ستایش هەمیشە بۆ خوای گەورە.

الشيخ إبن باز








## باشی داواکردنی لێبووردن

پرسیار: ئایا راستە هەر کەسێك کە دەڵێ:

خوایە لێم ببوورە، لێی دەبوورێت؟

وەڵام: ئەگەر مرۆڤ گوتی: ئەی خودایە لێم ببوورە، لە گوناهەکانم خۆش بە، ئینجا ئەمە ئەگەر بەدڵ و دەروونێکی ساف و بێ گەردبوو و لە ناخێکی پاك و خاوێن بوو و بە نیازێکی پوخت بوو و بەراستگۆیی داوای خۆشبوونی لەخوای گەورە کردو، لەهەمان کاتیشدا پێویستە تەوبەکاربێ و مەرجەکانی تەوبەی تەواو جێبەجێ کردبێ، ئەو کاتە بێگومان خوای گەورە کە (لێبووردەیە) یەکێکە لە ناوە هەرە جوان و مەزنەکانی خۆی، خوای گەورە لە هەموو تاوان و ستەمەکانی بەندەی خۆی خۆشدەبێت بەتەوبەکرد، بە تەوبەکردنی ئێجگاری، بە گەڕانەوە بۆ رێی راست بۆ خوداپەرستی و کڕنۆش بردن، ئەرکەکانی تەوبەکاری تەواو و راستگۆ لەگەڵ خوای مەزن، ئێجگار گەورەیە، ئادەمیزاد ئەو تەمەنە دوورو درێژەی کە بە ساختەکاری، بە قۆڵبڕی، بەدرۆ سوێند خواردن، ستەم کردن، بوختان کردن، شاهێدیدان بۆ خەڵکی نەناس، ستەم کردن، پەیمان شکێن، قەرزنەدانەوە، بوختان کردن، خەڵك لێککردن، دوورکەوتنەوە لە شوێنی خوا پەرستییەکان و مزگەوتەکان، گوێنەدانە وتارە ئایینییەکان، بەزەیی نەهاتنەوە بەهەژارو پرسی،



گوێنــەگرتن لــە قــسەی راســت و دروســت، زەکــات نــەدان و پــارە کۆکردنەوە، ئەوەی تەمەنێکی دوورودرێـژ بـەم کـارە بەدانـە بەسـەر بـەرێت و تەوبـەی بکـاتو روو لـەخوای گـەورە بکاتـەوە، هەڵبەتـە قەرەبووکردنەوەی ئەم هەموو تاوانـە دیـسان تەمـەنێکی دوورودرێـژی دەوێت، بەڵام چاو لە تاوانەکانی پێـشوو دەپۆشـێت ئەگـەر تەوبەکـە ئێجگاری بێت و بەندە لە ناخی دڵیەوە بەراستی و راستگۆیی پەشیمان بوویێتەوەو بەرانبەر دیدی رووناکی مەزنێتی خوا هەست بەشەرمەزاری بکات، خوا لێی دەبوورێت و لەهەموو تاوانەکانی سەردەمی پێشووی خۆش دەبێت. بەگەورەیی خۆی دەفەرمووێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾ ﴾ البقـــــرە: ٢٢٢

واتە: بەڕاستی خوا تەوبەکارانی خۆی دەوێت، پاکانی خۆش دەوێت، پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) فەرمووی:

دڵخۆشبوونی خوا بەتەوبەی بەنـدەی خـۆی، وەکـو دڵخۆشـی ئـەو مرۆڤەیە کە لەکاروانێکدا لەگەڵ وشترێکی خۆی دایەو وشترەکەی بـە بارەوە کە هەموو خۆراك و خواردنەوەی خۆی تێدایە، لێی بـزر دەبـێ، زۆر بە دوایدا دەگەڕێ و ماندوو دەبێ و، هێزی لێ دەبڕێ، ناچار دەبێ



لە ژێر درەختێکدا لەسەر زەوی لێی رادەکشێ و چاوەڕێی مردن دەکات، هێشتا پێلووی چاوەکانی ناکەونە سەر یەك کە ئاوڕی لا تەنیشتێکی خۆ دەداتەوە سەیر دەکات چڵەوی وشترەکەی بەلقێکی درەختەکەوە گیربووە، ئەویش جڵەوەکە دەگرێ گوتی: ئەوی خودایە تۆ بەندەی منی و من خودای تۆم. لەتاو خۆشی خۆی هەڵەی کرد، کەس رادەی ئەو خۆشییە نازانێت ئەگەر نا کێ هەیە وەکو ئەم کاروانچییە تووشی ئەم جۆرە کارەساتە بێت خوای گەورە حەز دەکات بەندەی خۆی تەوبەی بۆ بکەن، هەروەها حەز دەکات بەندەی خۆی هەموو دەمێك کە دەم وزاری دەکاتەوە بەناوهێنانی خوا بکاتەوەو لەخوا داوای لێبووردن بکات، ئەگەر هەڵەی کردبێ یا نەیکردبێ. خوای گەورە لە کتێبی پاکی خۆی لە چەندین ئایەتدا داوا لە بەندەی خۆی دەکات هەموو سات و وەختێك هاواری خواو داواکاری لێبووردنیان لەسەر زار بێ، داواکردنی لێخۆشبوونیش داواکردنی بەخشینە لە گوناهەکان، داواکردنێکە بۆ نەهێشتن و سڕینەوەی ئەو کردەوە بەدانەی کە نە بەزار دەگوترێن و نە بەنووسینیش دینە سەر خامە. لێبووردنو بەخشینیش شاردنەوەی گوناهەکانەو خۆپارێزیشە لە گوناهی داهاتوو چونکە لێبووردنو بەخشین لە زمانی عەرەبیدا بەمانای (المِغْفَرْ) دێت و ئەویش ئەو کڵاوە رەقە یا ئاسنینەی سەر مرۆڤە کە لە کاتی شەڕدا لە تیرو







لێدانی شمشێرو زەبری دیکەی شەڕکەران دەپارێزی، ئیدی بەم شێوەیە لێبووردنو بەخشین، پۆشین و شاردنەوەی گوناهەکانەو خۆپارێزیشە لە سزایەکانی.

الشیخ ابن عثیمین







## وەسوەسەی شەیتان

پرسیار: مـن گـەنجێکی موسـڵمان و ئیمانـدارم و، بـەڵام زۆر بـە گومانم، کاتێکیش که دەستنوێژ هەڵدەگرم گومان لەوە دەکەمەوە کە دەسـتنوێژەکەم بـە چـاکی هەڵنـەگرتبێت دووبـارەش دەسـتنوێژ هەڵدەگرمەوەو کاتی لە باری نوێژکردندا دەبم و چۆکدەدەمەوە گومـان لـەوە دەکـەم بایـەکم لێبـەربووبێت نوێژەکـە دەبـڕم و جـارێکی دی دەستنوێژ هەڵدەگرمەوە.

کاتێ لە دەرەوەی وڵات بووم گۆشتم نەدەخوارد لەبەر ئەوەی گومانم دەکردەوە کە ئاژەڵەکە بە شێوازی نائیسلامی سەربڕابێت و، هـەروەها سەمون و پسکویتەکانیـشم نـەدەخوارد گومـانم لـەوە دەکـردەوە کـە نەوەکو شتێکی حـەڕامیان تێکردبێـت وەکـو چـەوری مانگـا کـە بـە شێوازی ئیسلامی نەدەکوژرانەوە ئەم گومانانـە ماوەیـەکی زۆرە بـیرو لێکدانەوەی مێشکی منیان وەکو تەونی جاڵجاڵۆکە ئابڵۆقە داوە، برای گەورەم زۆر ئامۆژگاری کردم کە لەم گومانانە دووربکەومەوە بەڵام ئەم ئامۆژگارییانە دڵی منی پتر خستە گومانەوە.

ئەی شێخی بەڕێز بڵێ چی بکەم؟

کاتێ دەشنووم گوێ بە نوێژ نادەم و کە بـە ئاگـاش دێمـەوە نوێـژە چووەکە دووبارە ناکەمەوە؟







وەڵام: بەگومان بوونو، دوودڵبوون و، دڵ لێ پیس کردن کە تووشی بیروهۆش و لێدانەوەی مێشك دەبێ بەتایبەتی لە بڕواو پەرستنەکان و هی دیکەش تاکو لە خودی خوای گەورەش هەمووی لە نەگریسەوەیە، بۆیە کاتێ یاوەرەکان (خوا لێیان رازی بێت) لەلای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵای ئەوەیان کرد کە لە دڵیان شتێك هەیەو شتەکەشیان زۆر بە گەورەو گران هاتووەتە بەرچاو بەڕادەیەك قسەی لێنەکەن، پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداریانی کردەوە کە ئەمە راست و راستگۆیی بڕوایە بەمانای پوختەکەیەتی، ئەمەش چونکە شەیتان نموونەی وەکو ئەم گومان و دوودڵی و دڵ لێ پیس کردنە دەخاتە دڵی موسڵمانە بڕوا بە تێنەکان کە بەرانبەر خوای گەورە لە پەرستن و ناسینی خۆیدا هیچ گومانی نییە ئەمەش هەر بۆ ئەمەیە تاکو لە پەرستن و ناسینەکە دوودڵ بێت و وردە وردە دوو دڵیەکە گەورە بێت بەڵکو بە ئێجگاری واز لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی ئایین بێنی بەڵام ئەوەی بەخوێندنەوەی قورئان رۆشنبیری ئایینی تەواو بێت و پێڕەوی سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بکاتو لەسەر بڕوای خۆی مکوڕ و ڕشت و جێگیر بێت یا ئەوانەی لە ئایینەکانی دیکە ترازاون ئەمانە بەگشتی گومان و دوودڵی کاریان تێناکات چونکە دڵ و دەروونو مێشکیان لەم مەسەلانە سڕاونەتەوەو پاك و بێ گەرد بوونەوەتەوە.







بەم گەنجە دەڵێین: ئەوەی پێویستە لەسەری ئەوەیە کە نـاوی خـوای لێبێنێ و نەفرەت لە شەیتان بکات و گوێنەداتـە. دوودڵـی و هێنـدەش بەخەیاڵی بەتاڵ و نابەجێ پەیوەست نەبێ نە.لە دەسـتنوێژ هـەڵگرتن‌و نە لە نوێژکردن و نە لە ئەوانی تریش، ئەم گومانـە بەڵگـەی ڕاسـت و پوختی باوەڕەو بەڵام ئەگەر هـەر خـۆت بـۆ دوودڵـی و گومـان شـل بکەیت و خـۆت بەدەسـتەوە بـدەیت ئەمـە بەڵگـەی لاوازی بڕوایـەو مانای ئەوەیە ئەم گەنجە لە ئـیش و کـاری ژیـانی ڕۆژانـەی خۆیـشیدا توانای ڕای جێگیری نییە پێی دەڵێین: ئـەم گومانـە هـیچ ڕووی نییـە، تۆش بۆ نموونە کاتێ بۆ شتومەك کڕین یا فرۆشتن دەچیتە بـازاڕ، ئایـا لەم شتەی لە بازاڕ دەیهێنیتەوە گومانی تێدەکەیت.

وەڵام بۆ ئەمـە: نـەخێر، چـونکە شـەیتان بـۆ نموونـەی وەکـو ئـەم مەسەلانە دوودڵی ناخاتە دڵی مرۆڤ و، بەڵام ئـەم دوودڵیـە لـە کـاتی پەرستنی خوا دەخاتە نێـو دڵـی موسـڵمانان تـاکو پەرسـتنەکەی لـێ گەندەڵ بکاتەوەو بـڕوای لاوازی بکـات بـەو ئومێـدەی بـە ئێجگـاری بیڕوخێنیت و بە ئێجگاریش واز لە خاسـیەتمەندی مرۆڤـی موسـڵمان بێنێت.

ئەگەر گومانەکان زۆربوون‌و بەسەر مێشکدا کەڵەکەیان کرد گوێی خۆتیان بۆ شل مەکە.







بەڵام گومانکردنت لە خۆراکەکان کە لــە بنەچــەدا حــەڵاڵن ئەمــە هیچ پەندێکی تێدا نییە کە خەڵکی دی بەم گومانانەی تــۆ لاســاییت بکەنەوە یا ئەوەتا خەڵك بەم گومانانەی تۆ بگەنــە ڕاســتی، هــەر بــۆ ئەمەش ئــافرەتێکی جوولەکــە لــە خەیبــەر مــەڕێکی بــەدیاری دایــە پێغەمبەری خوا، ئەویش لێی خواردو، جوولەکەیەکی دی داوەتی کردو نانی جۆ و پاشماوەیەکی گەنیوی بۆن دڕنی لە پێش دانا ئــەویش بــەبێ دوودڵی لێی خوارد.

لە ڕاستکراوەکانی بوخاریــدا هــاتووە کــە میللــەتێك تــازە ببوونــە ئیسلام گۆشتیان پێشکەش بە کۆمەڵێك لە موسڵمانان کرد، ئەوانیش گوتیان: ئەی نێرراوی خوا، میللەتێك گۆشتمان بۆ دێنن نــازانین نــاوی خوای لەسەر بێنین یا نا؟ ئەویش (ﷺ) پێیانی گوت: (ناوی لێببێــنن و بیخۆن) لەڕاستیشدا لە کۆشتنەوەی مەڕومالات و ئەوانی دیکەش کــە ئایا کوشتنەوەکە حەڵاڵە یا نا لەمە پێویستە کۆمەڵی زانایــانی ئــایین بڕیاری لەسەر بدات نەك دوودڵی تاکە کەسی موسڵمان.

قەدەغەکردنی ئەوەی خوای گەورە بۆ بەندەی خۆی حەڵاڵی کــردووە ڕۆژ بەڕۆژ کەم دەبێتەوەو مەرجیش نییە ئەوەی لە قورئان و ســوننەتدا ناوی هاتووە تەنیا خواردنی گۆشتی ئەوان حەڵاڵ بــن، گــرنگ ئەوەیــە بەدەیان و سەدان ئاژەڵ و باڵندەی دیکە هەنە کە گۆشتیان لە چەشــنی



گۆشتە حەلاڵەکانە بۆ ئەمەش بڕیاردەر کۆمەڵی زانایانی ئایینییەو دیسانیش دەڵێینەوە ئەمە ئەرکی دوو دڵی تاکە کەسێکی موسڵمان نییە.

بەڵام دەربارەی قسەکەی پرسیارکار: ئەو ئەگەر لێی خەوت گوێ ناداتە نوێژەکان.

هەروەها ئەمەش لە شەیتانەوەیە، لە راستکراوەی بوخاریدا هاتووە کە بە پێغەمبەر(ﷺ) ی خودا گوتراوە: پیاوێك نووسیت تاکو بەیانی و بۆ نوێژ هەڵنەستایەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: (ئەو پیاوە شەیتان میزی لە گوێی کردووە).

شەیتان لەوانەیە ئەوەی بنوێ خەوەکەی لێ گران دەکات ئەویش بۆ نوێژی بەیانیو یا نوێژەکانی دیکە بە ئاگا نایێت.

دەکرێ چارەی ئەم حاڵەتە بکرێ، بەمەرجێ ئەوەی نیازو بڕیاری هەبێ کە هەموو نوێژەکان بکات، دەکرێ زەنگێك دابنێ تاکو بە ئاگای بهێنێت یا بەکەسێکی دیکەی وریاو خەوسوك بڵێ لەکاتی نوێژەکە بە ئاگای بێنێ.

الشيخ ابن عثيمين







## تەوبەی ئێجگاری گوناهەكان دەسڕێتەوە

پرسیار: هەندێ لە وێنەم لە لای هاوڕێیەكانم هەیە داوام لێكردن وێنەكانم بدەنەوە تاكو لە ترسی ئازاری خوای گەورە بیاندڕێنم، هەندێكیان چەند وێنەیەكیان گەڕاندەوەو هەندێكی دی لارییان هەبوو بە پاساوی ئەوەی گوناهەكە بۆ ئەوانە نەوەكو بۆ من، ئایا ئەمە راستە تكایە بۆ ئەمە ئامۆژگاریتان چییە؟

وەڵام: تەوبەی ئێجگاری لەگوناهەكان، خوای مەزن بەم تەوبەیە هەموو گوناهەكانی كە پێشوو هەیە دەیانسڕێتەوە هەروەكو خوای دانای زانا دەفەرمووێت:

﴿ ......وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾ النور :٣١.

واتە: هەمووتان تەوبە بكەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەی ئیماندارەكان، تا رزگارو سەركەتووبن.

پێغەمبەر(ﷺ) ی مەزنیش دەفەرموێت:



بە ئیسلامبوون هەموو گوناهەکانی کە پێشووتر هەیە دەیانڕمێنێت و دەیانسڕێتەوە، تەوبەکردنیش هەموو گوناهەکانی کە پێشوو هەیە دەیانڕمێنێت و دەیانسڕێتەوە. تۆ ئەوەی پێویستە لەسەرت ئەو وێنانەی بەدەستەوەن هەموویان بدڕێنە ئەمەش لەسەر فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): هیچ وێنەیەك نەمێنێت کە ژێرخاکت نەکردبێت و بیناو گومەزیش لەسەر هیچ گۆڕێك بەرزنەکرابێتە مەگەر لەگەڵ زەوی تەختت کردبێت چونکە هەردوو کێڵەکان ناونیشانی چاکن بۆ مردووکە. (أخرجه الامام مسلم في صحيحه).

بەڵام دەربارەی ئەم وێنانەی کە لەلای خەڵکی ماونەتەوەو ئەگەر داوایان لێبکەیتەوەو نایگەڕێننەوەو بۆ گلدانەوەی لای خۆیان پاساوت بۆ دێننەوە، تۆ خۆت لە سزای تاوانەکە ڕزگار کردووەو تەوبەش لە سەر تۆی سڕیوەتەوەو تاوان گوناهەکە دەکەوێتە سەر ئەستۆی ئەو کەسەی لەلایەتی. خودای گەورەش کە لەبەندەی خۆی نزیکەو لەهەموو کارێکی ئاگادارە و ئاگاداری هەموو جوولەیەکی سەرجەم زەمینە، ئەم خودایەی دەیپەرستینو کڕنۆشی بۆ دەبەین لێبووردەو بەخشندەیە.

الشيخ ابن باز







# خوێندن و زانستی شەرعی

پرسیار: ئایا ئەگەر کەسێك بەهۆی خەریکبوونیەوە بە خوێندنی خۆی کە هیچ پێوەندی بە زانستی شەرعییەوە نەبێت دەکرێ ئەمە بکاتە پاساو بۆ ئەوەی هیچ لە زانستی ئایینەوە نەخوێنێت یا هەر نەزانێت؟ یا ئەوەتا بەهۆی خەریکبوونیەوە بە ئیش و کاری ژیانی رۆژانە؟

وەڵام: خوێندن و زانینی زانستی شەرعی پێویستە و ئەرکی ئایینی هەموو موسڵمانێکە کە تاکو ئەو هێندەی لە ئایینەکەی خۆی دەگات و ئەرکەکانی بە رێکوپێکی و بێ هەڵە جێبەجێ دەکات بەمانای سوننەتە لەوانەیە خوێندنی زانستی ئایینی ئەرکێك بێت لەسەر مرۆڤ کە ئەرکێك بێت بەدیداری چاو بەمانای ئەرکی چاو، شتەکە بە چاو ببیندرێت و بخوێندرێت و بچێتە مێشکەوە وەکو ئەگەر مرۆڤ ویستی خوا بپەرستی و لێیی بپاڕێتەوە، ئەو کاتە پێویست دەبێ لەسەی بەمانای (ئەرك) کە ئەو مرۆڤە بزانێت چۆن خوا دەپەرستێت و لە پاڕانەوەشدا چی داوا دەکات لەبەر ئەمە ئەوەی لەبەر هەر ئیش و کارێك کە ناتوانێت زانستی ئایینی بخوێنێت بۆ ئەوەی ماڵ و



منداڵەکانی  خۆی بەچاکی بژیێنێت، لەگەڵ ئەمەش جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی لە نوێژو ڕۆژوو ئەوانەی دیکە فەرامۆش نەکردووەو بە چاك و ڕەوانی جێبەجێیان دەکات دەڵێین، ئەم کەسە گلەیی لەسەر نییەو گوناهی نییەو، بەڵام وەکو (ئەرك) پێویستە لەسەر بەپێی توانای خۆی لەزانستی شەرعی فێرببێت.

الشيخ ابن عثيمين







# تەوبەکردن لە زینا

پرسیار: شەیتانی نەفرەتکراو هەڵیخەڵەتاندمو کاری ئابڕووچوونی زینام کرد و، من بەخۆم دەزانم کە ئەمە داوێنن پیسییەکی گەورەیەو، دەمەوێت بەرانبەر خوای لێبووردەو میهرەبان تەوبەی بکەم ئایا خوای مەزن بەم تەوبەیەم قایل دەبێت؟

ئەوەی راستیش بێت من لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئەم بەدرەوشتیە دەکەم و ئینجا تەوبەی دەکەم، ئایا تەوبەکەم لیٚ وەردەگیرێت، تکایە دڵنیام بکەنەوە خوا پاداشتتان بەخێر بداتەوە؟

وەڵام: تەوبەکردن دەرگای والایە تاکو خۆر لە رۆژئاواکانیەوە هەڵدێ. ئەوەی بۆ خوا تەوبە بکا تەوبەیەکی ئێجگاری لەهاوبەش پەیداکردن بۆ خواو ئەوانی لەمەش کەمتر خوا تەوبەکەی لێوەردەگرێ و لە هەموو گوناهەکانی ماوەی پێشوو خۆش دەبێت.

تەوبەی ئێجگاریش بریتییە لە : وازهێنان لە گوناهەکان بەمانای خود یەکلاکردنەوە، پەشیمانبوونەوە لە کردەوەی ماوەی پێشوو، نیازهێنان و بڕیاردانی راستی کە جارێکی دیکە لە ترسی خوای



گەورەو مەزنی و شکۆمەندییەکەی و نزاو تکاو پاڕانەوە تا بیبەخشێت و لێی ببورێت وەکو ئەوەی خوای میهرەبان دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا ﴾

التحريم: ٨.

واتە: ئەی ئەوانەی که باوەڕتان هێناوە، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بەگەڕانەوەیەکی ئێجگاری.

دیسان فەرمووی:

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾

الزمر: ٥٣.

واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە، نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا، چونکە خوا لەهەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت، بەڕاستی هەر ئەوە لێبووردەی بە بەزەیی یە.







زانایانیش لەسەر ئەمە ڕێککەوتوون کە ئەم ئایەتە لە بارەی تەوبەکارانەوە دابەزیوە. لەسەر ئەم سێ مەرجانەی باس کراوە لە راستی تەوبە مەرجی چوارەم زیاد کراوە کە ئەگەر بێتو مافی خەڵکانی دیکەی لەسەر بێ، ئەویش ئەوەیە مافەکانی لەماڵ و سامانو هی دیکە گەردنی خۆی ئازاد بکات لەمەش بە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): (ئەوەی ستەمی برایەکی خۆی لەسەر بێ گەردنی خۆی لێ ئازاد بکات بەمانای ستەمەکە لەسەر ستەملێکراوەکە هەڵگرێ تازووە نەوەك ماوەی بەسەر بچێ و ئەوا هێندەی بڕی ستەمەکە لێی وەردەگیرێ و ئەگەر چاکەو خێراتی نەبوو ئەو کاتە لە کارە خراپەکانی ستەملێکراو هەڵدەگیرێت و دەخرێتە سەر ئەستۆی ستەمکارەکە. (اخرجه البخاري في صحيحه).

پێویستە لەسەر موسڵمان لە هاوبەشی پەیداکردن و هۆیەکانی و هەموو کردەوەی خراپ و یاخیبوونو دوورکەوتنەکان لە ئایین زۆر هۆشیار بێت بە زەین و هۆش مامەڵە لەگەڵ هەموو پێڕەوو پرۆگرام و ئەرك و سوننەتەکان بکات هێندەی کەڵە موویەك نە ئەرکەکان دوا بخات و نەدرێغی لە پێویستییەکانی دیکەی ئاینیش بکات. چونکە



هەر ئەوەتا تووشی کردەوەیەکی خراپ ببێت لەوانەیە لە تەوبەکەی خۆی سەرکەوتوو نەبێت، بۆیە لەخوا پەرستی و ناسینی و پێڕەوکردنی سوننەتەکان پێویستە لەسەر موسڵمانی راست و راستگۆ لەگەڵ خودا، لەوانەی خوای مەزن قەدەغەی کردوون زۆر هۆشیار بێت، لەهەموو حاڵەتەکانی ژیانی رۆژانەی خەڵکانی موسڵمان بۆ هۆشیار بوون رۆشنبیری ئایینی گەلەك پێویستەو لەباسی پێشووش چەندین نموونەمان هێنایەوە کە رۆشنبیری کەسی موسڵمان نەوەکو تەنیا پێویستە بەڵکو (ئەرکە) چونکە هەندێ جار هەموو پێویستیەکانی سەر شانی کەسی موسڵمان تەواو جێبەجێ ناکرێن یا ئەوەتا جێبەجێکردنیان لە توانای ئەو کەسەدا نییە چ بەهۆی خوێندنی بابەتی دیکە بێ یا بەهۆی ئیش و کاری بژێوی ژیانی رۆژانەی ماڵ و منداڵەکانی خۆی بێت یا ئەوەتا هەندێ جار رژێمە ستەمکارەکان هێندە ژیانی خەڵك گران دەکەن، خەڵکەکە لە جێبەجێکردنی پێویستییەکانی ئاین دوور دەکەونەوەو بەمەشە بڕوایان بە ئاین لاواز دەبێ و سوننەتەکان فەرامۆش دەکەن، بۆیە جێبەجێکردنی پێویستیەکان بووەتە (ئەرك)ی سەرشانی کەسی موسڵمان ئەم ئەرکەش



بــە خــۆ رۆشــنبیریکردن تــەواو دەبێــت وەکــو خوێندنــەوەی قورئــان و ئامادەبوون و گــوێگرتن لــە کــۆڕە ئایینیــەکان. هەمیــشە تەوبــەکار پێویستە  هەموو ساتێك لەخوا بپارێتەوە کە تەندروستی چاکی بـداتێ تاکو باری خوا پەرستنو  ناسینی لە رۆژی زیندووبوونەوەو ئامادەبوونی بەر دەرگای دادوەری لێپرسینەوە پتر بێ و پاداشتەکانی گەورەتر بــێ و لەو چاکەیە خوا لەگەڵیدا کردووە روو سوور بێ.

هەروەها کەسی تەوبەکار  نابێ گــوێ بــۆ نیازەکــانی شــەیتان شــل بکات و بەرانبەر فڕوفێڵەکانی نەرم بــێ و تووشــی کــردەوەی خــراپ و داوێن پیــسی ببێــت بــەو نیــازەی کــە جــارێکی دی تەوبــە بکاتــەوەو بێگومان ئەوەی شەیتان رێگای  خراپەکاری بۆ دەڕازێنێتــەوەو ئــەویش شتە خراپەکان دەکا بەنیازی دووبارە تەوبەکردنەوە لەوانەی بەندە ســزا بدرێت و بەربەستێکی گەورە لەنێوان خۆی و خودی  خوا هەڵبەســتێت بەمــەش ئەوپــەڕی پەشــیمانی پەشــیمان دەبێتــەوە و دڵگرانــیو پەرۆشیەکی گەورە دروست دەکات لــە کاتێکـدا کــە پەشــیمانی دادی نادات.









خوای مەزن ئەو پەناگەیەیە کە مەڵبەنـدو هەوارگـەی چـاکەکارانی ڕاســتەقینەیە، هــەموو چـاکەو بەخـشینێك لـەم پەناگـەو مەڵبەنــدو هەوارگەیە دەست دەکەوێت، مرۆڤی باوەڕدار، خـودا پەرسـت و خـودا ناس و تەوبەکار هەر ئەو پەناگەیە کە هاواری بۆ ببات و داوای خێـرو بەزەیی لێبکات، ئەوانەی تەنیا لەم پەناگەیە هاواری خـودای گـەورەی خۆیان دەکەن بێگومان لەدوا ڕۆژدا قازانجیان کردووە.

خوای مەزن دەفەرمووێت:

﴿وإياي فارهبون﴾البقرة: ٤٠.

واتە: وەهەر لەمن بترسن.

خوای دەروون پاك و میهرەبان دەفەرمووێت:

﴿ويحذركم الله نفسه﴾آل عمران : ٢٨

واتە: وە خوا دەتانترسێنێت لە سزای خۆی.

خودای گەورە کە هەم پێشخەرەو هەمیش دوا خەرە دەفەرمووێت:







﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَاۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾ فاگر: ٥-٦

واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە، دەی کەواتە با ژیانی دنیا فریوتان نەدات، وە با شەیتان بە (بەزەیی و لێبووردەی) خوا فریوتان نەدات، بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە، دەی کەواتە ئێوەش بەدوژمنی خۆتانی دابنێنن بێگومان ئەو (شەیتان) تاقم و کۆمەڵەکەی بانگ دەکات، بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی (دۆزەخ).

زۆر ئایەتی دیکەش بەم مانایەوە هەیە.

الشیخ ابن باز








## قسەی دەروون بۆ ئەنجامدانی کردەوەی خراپ

پرسیار: هەندێ جار لە دەروونەوە ئارەزووی ئیشێکی خراپ دەکەم یا قسەیەکی ناشیرین دەکەم، بەڵام زۆر جاریش نە ئارەزووەکە جێبەجێ دەکەم و نەقسە ناشیرینەکەش دەکەم، ئایا بەمە گوناهبارم؟

وەڵام: ئەگەر مرۆڤ شتێکی بەخەیاڵدا هات، یا ئارەزووی کرد، یا بیری لێکردەوە کە بیکات و (نەیکردو) ئینجا ئەگەر بێتو ئەم (نەکردنە) نەکردنێکی پێویست بوو یا کارێکی حەڕام بوو و، ئەم خۆی بەدەست خەیاڵەکەوە نەداو ئەوەی پێویست بوو کردیو وازی لە کارە قەدەغەکراوەکە (حەڕام) هێنا ئەمە لەسەر ئەو کارەی کە لێی روویدا پاداشت دەکرێتەوە، چونکە ئەمەی بۆ خوای گەورە کردووە، ئەمەش لە فەرموودەی راست چەسپێندراوە کە ئەوەی نیازی یا ویستی یا ئارەزوویکرد کردەوەیەکی خراپ بکات و نەیکرد چاکەی تەواوی بۆ نووسراوە چونکە لەخوای گەورە ترساوەو نەیکردووە بەمانای ئەم نەکردنەی بۆ خوای مەزن بووە. لێرە پێویستە درێژە بەهەندێ روونکردنەوەی دی بدەین بۆ ئەو کەسەی خەیاڵی شتی خراپی



حەرامی کردووەو وازیشی لێهێناوە کـە ئایـا پاداشـت دەدرێتـەوە یـا پاداشت نادرێتەوە.

دەڵێین: ئەوەی خەیاڵی کاری خراپی حەڕام دەکاو کارەکـەش ناکـات لە یەکێ لەم سێ حاڵەتانە دەرناچێت:

١-یا ئەوەتا کارەکەی پێناکرێت، وەکـو ئـەوەی لەباریـدا نـەبێت، یـا توانای نەبێت، یا کـەموکوڕی هـەبێت لەمـە گونـاهی بکەرەکـەی دەنووسرێت، ئەمەش بە گوێرەی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ):

(ئەگەر دوو موسڵمان شمشێریان لێکبەرزکردەوە بکـوژو کـوژراو لـەنێو ئاگرن) گوتیان ئەی نێرراوی خوا ئەمە بکوژەکەیە ئـەی کوژراوەکـە بۆچی؟ فەرمووی: (ئەویش دەیویست هاوڕێیەکەی خۆی بکوژێت).

٢-دوومین حاڵەت: لە ترسـی خـوای گـەورە واز لـە قەدەغەکراوەکـە (حەرام) بێنێت ئەم جـۆرە دەسـتلێهەڵگرتنە لـە کـردەوەی خـراپ چاکەی تـەواوی بـۆ دەنووسـرێت چـونکە لـە راهـی خـوای مـەزن نەیکردووە، یا وازی لێهێناوە یا دەستی لێهەڵگرتووە یـا بـۆ ڕۆژی قیامەتی هەڵگرتووە.



٣-وازی لە کردەوە خراپەکە هێنابێ بەوەی بە پێتر خەیاڵی بۆ نەچووبێت، یا پێتر بیری لێنەکردبێتەوە، یا هەر لەسەرەتاوە گرنگی پێ نەدابێت و خۆی پێیەوە خەریك نەکردبێت. ئەمەش بۆ ئەو نییە لەسەر ئەویش نییە، بەمانای نە پاداشتی لەسەرەو نە گوناهی لەسەرە.

لێرەدا حاڵەتی چوارەم هەیە، ئەویش: وازهێنان یا دەستهەڵگرتن لە قەدەغەکراو لەبەر ئەوە بێ کە کەسەکە توانای بەسەردا نەشکێ بەمانای دەسەڵاتی نەبێ و بێ توانا بێ، بەڵام شتێك ناکات یا هەوڵێك نادات کارە حەرامەکە ئەنجام بدات بەڵکو نیازی کردو ئومێدی کردەوە خراپەکە دەکات، ئەمە هێندەی بڕی نیازەکە گوناهی دەکەوێتە سەرو وەکو ئەوە نییە کە هەوڵی بۆ دەداو ڕێگە بۆ ئەنجامدانی کارە قەدەغەکراوەکە خۆش دەکات و، بەڵام نەیتوانی یا پێی ئەنجام نەدرا یا کارەکە ڕێکنەکەوت گوناهی ئەمە کەمتر لەوەی یەکەمە کە پێشتر هێمامان بۆ کرد.

الشیخ ابن عثیمین



## تەوبەو گەڕاندنەوەی نوێژە چووەکان

پرسیار: تەمەنم ئێستا ٢٩ ساڵە لەتەمەنی بیست و چوار ساڵیەوە دەستم بە نوێژەکان کردووە، هێشتا لێی بەردەوامم سوپاس و ستایش بۆ خوای مەزن کە ڕێی ڕاستی پێ نیشان داوم، دەستم پێکرد بە گەڕاندنەوەی نوێژە چووەکان، لە نوێژەکانی ئەو ساتەوە کە تەمەنم پانزە ساڵان بوو و ئیدی بە پێی توانام دەستم پێکردووە نوێژەکان دەگێڕمەوە بەڵام لەمە ڕای خەڵك جیاوازە، هەیانە کە دەڵێ: پێویست بە گەڕانەوە ناکات تەوبەی ئێجگاری بەسەو، هەیە کە دەڵێ: پێویست بە گەڕاندنەوەیانە تکایە ڕاستیمان بۆ دیار بکەن؟

وەڵام: ڕاستی پێویستت بە گەڕاندنەوەکان ناکات و، تەوبەی ئێجگاری بۆ ئەمە بەسە کە بریتیە لە مانە: پەشیمانبوونەوە لەوەی لەتۆ رووی داوە، بەردەوامبوون لەسەر نوێژ و، نیازو بڕیاری ڕاستگۆ کە واز لە خوا پەرستی نەهێنیت، خوای مەزن دەفەرموێت:

﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغۡفَرۡ لَهُم مَّا قَدۡ سَلَفَ وَإِن يَعُودُواْ فَقَدۡ مَضَتۡ سُنَّتُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الانفال: ٣٨.

واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: بە ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون، ئەگەر کۆتایی بهێنن (بەبێ بڕواییەکەیان)، بەڕاستی (خوا) دەبووری لەهەرچی لەوەو پێش کردوویانە:

هەمدیسان خوای مەزن کە دەسەڵاتدارو ئاشکراو دیارە دەفەرمووێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا ﴾

التحريم: ٨.

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بەگەڕانەوەیەکی ئێجگاری.

پێغەمبەری (ﷺ) خۆشەویستیش دەفەرمووێت:

(ئیسلامبون ئەوەی پێشوو دەڕمێنێت و دەسڕێتەوەو، تەوبەش هەرچی لەوەو پێش کراوە دەیانسڕێتەوە.

هەروەها درووود و سەلامی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت:

(تەوبەکار وەکو ئەو کەسەیە کە هیچ گوناهی نەبێت).

داوا لەخوای گەورە دەکەم لە ئاییەنی خۆت پتر تێبگەیت و بەرانبەر بە شتی نادروست چاو نەپۆشیت هەمیشە لەسەر شتی ڕاست و ڕەوا



دەنگت هەڵبڕی و خۆت له گوناهەکان بپارێزیت لەسەر خوا پەرستی و سوننەتی پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ) بەردەوام بیت کاری چاك بکەیت و هاوکاری چاکەکاران بیت.







# زانیاری بانگەواز بۆ خواپەرستی

پرسیار: هەندێك لەوانەی کە بە پابەندبووانی ئایینیان دادەنێین بە شێوەیەکی هەڵەو وشك مامەڵە لەگەڵ خەڵکی دی دەکەن، هەندێکیان وا پێدەچن کە هەموو دەمێك روو گرژو ترش بن، بۆ ئەمانە ئامۆژگاریتان چییە؟

ئەرکی موسڵمان بەرانبەر برای خۆی چییە بەتایبەتی ئەگەر ئەو برایە کەموکوڕی لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی ئاییندا هەبێ؟

وەڵام: ئەوەی کە سوننەتی پاککراو ئاماژەی بۆ دەکا سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی ئەرکی موسڵمانە ئەوەیە کە هەموو دەمێك چاوی لە یارمەتیدانی خەڵکی دی بێ، هاوکارییان بکات، قسەی راست بکات، چاکە بکاو خێر بکات، لەمامەڵە راستگۆ بێت، پەیمان بپارێزێت، دەستپاك بێت، چاو و دەمی خۆی بپارێزێت، گوێ لە قسەی پاشملە نەگرێ، بوختان نەکا، قسەی کەسێك لەلای کەسێکی دی نەگێڕێتەوە، لەگێڕانەوەی مەسەلەیەکە پێویست زیادو کەم نەخاتە سەر، چاوی لە نامووسی خەڵکی دی نەبێ، خەڵك بەکەمو سووك سەیر



نەکات، قەسەی ناشیرین نەکات، جوێن نەدات و سوێند بە هیچ شتێك نەخوات، ئەم ڕەوشتانەو بەدەیان ڕەوشتی چاکی دیکەش پێویستە کەسی موسڵمان پێیەوە پابەند بێت، پەیوەست بوون بەم ڕەوشتانە کە سێتییەکی گەورەو گران بەتاك دەدات کە خۆی لەخۆیدا جوانی یا نموونەی ڕەوشت چاکی مرۆڤ پیشان دەدات و ئەمانەش بەگشتی ڕوو و ناوەڕۆکی موسڵمانی چاك پیشان دەدەن و لەهەمان کاتیشدا بانگەوازێکی تەواوە بۆ خوا پەرستی خوای مەزنیش کە هەمیشە بەخۆی بەخشندەو میهرەبانە، بەسۆزو بە بەزەییە، شایانی سوپاس و ستایشە، پایە بەرزو ڕێزدارو گەورەو بە توانایە.

ئەوەی پێویستیشە لەسەر شانی مرۆڤ ئەوەیە کە بە دانایی و نەرمی و ئاسانکاری بانگەواز بۆخوای گەورە بکات، چونکە خوای شکۆمەند بە موحەممەدی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموو:

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ﴾النحل:١٢٥



واتە: (خەڵکی) بانگ بکە بـۆ ڕێبـازی پـەروەردگارت، بـەلێزانیی‌و دانایی‌و ئامۆژگاری چـاك و شـیرین، وە لەگـەڵیان بـدوێ( موجادەلـە بکە)، بە چاکترین شێوە.

خوای مەزنیش پێی فەرموو:

﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ ﴾ آل عمـران: ١٥٩

واتە: بەهۆی بەزەیی خواوەیە، بۆ ئەوان نەرم و نیانی بووی، ئەگـەر تۆ، بەدخوو و قسە ڕەق و، دڵڕەق بوویتایـە، ئـەوە هـەموو بڵاوەیـان دەکرد، لەدەورت ، کەواتە لێیـان ببـوورە، و داوای لێبووردنیـان بـۆ بکە.

خوای گەورە کاتێ موسا و هاوروونی بۆ فیرعەون نارد فەرمووی:

﴿ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ ﴾ طه: ٤٤.



واتە: جا قسەی لەگەڵ بکەن بە نەرم و نیانی، بەڵکو بیر بکاتەوە یا بترسێ( لە سزای خوا).

پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) هۆشیاری داوە کە دەفەرمووێت: (خوای گەورە بەنەرم و نیانی دەدات بە توندو تیژی نادات).

هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) ئەگەر نێردراوێکی بناردایە دەیفەرموو: (ئاسانی بکەن و دژواری مەکەن و مزگێنی بدەن و لێی دوورەپەرێز مەبن ئێوە نەرمکارن و ئاسانکارن بۆ ئەوە نەنێردراون دژواری بکەنەوە).

بەم شێوەیە پێویستە لەسەر بانگەوازکار کە دەبێ نەرم بێ، رووخۆش بێ، سنگ فراوان بێ، تاکو ئەوکەسە بەدەم بانگەوازەکەوە بێت و بەوەی داوای خواپەرستی لێدەکات داوکەی لێوەرگرێت و پێی قایل بێت، پێویستە داواکارییەکەی تەنیا بۆ خوای گەورە بێت بەمەش دڵسۆز دەبێت خوای بەخشندەش بانگەوازەکەی بۆ ئاسان دەکات خەڵکی دێنە سەر ڕێی راست و بەرانبەر بەمەش لەلای خوای گەورە پاداشتی گەورەی دەبێت.



بەڵام ئەگەر ئەمە بۆ خودی خۆی بانگەوازی کرد وەکو بڵێی دەیەوێت سەرکەوتنێك بنوێنێت یا ئەوەتا هەست دەکات ئەمە دوژمنیەتی و دەیەوێت تۆڵەی لێبکاتەوە لەمەش بانگەواز یا داواکردن یا دوعاکردن کەموکوڕی تێدەکەوێت و لەوانەشە خێرو بەرەکەت و چاکەشی کەم لێبکەوەێتەوە ئامۆژگاریم بۆ برایانی بانگەوازکار ئەوەیە ئەم هەستە هەست پێبکەن، کە ئەوان بۆ بەزەییهاتنەوە بە خەڵك خەڵك بانگەواز دەکەن و هەمیشە بۆ گەورەیی و مەزنێتی ئایینی خوای گەورەو بەسەرکەوتنیەتی.

الشيخ ابن عثيمين








# بەردەوامبوون لە سەر تەوبەکاری

پرسیار: من گەنجێکم بە موسڵمانی لەدایکبوومەو هەرگیز وازم لە نوێژەکان نەدەهێناوە بەڵام قەزاو قەدەری دنیا وایکرد روو لە دەرەوەی وڵات بکەم، ئیدی ماوەیەك لەگەڵ خێزانی خۆم بووم‌و ئینجا بەبێ ئەوان بەتەنیا مامەوەو ماوەی پتر لە چوار ساڵی تەواو وازم لە نوێژ هێنا، زۆر شتی وەکو داوێن، پیسیشم کردو، بۆ ماوەی چوار ساڵیش لەرەمەزاندا بە رۆژوو نەبووم و، لەگەڵ هاوسەری خۆم لە رۆژی رەمەزاندا جووت بووینەتەوە، ئەمانە هەمووی بەهۆی هاوڕێییە خراپەکانەوە تووشیان هاتم، ئێستا من بۆ پەروەردگارم تەوبەم کردووەو لەوانەی لەمەو پێش کردوومن پەشیمانم، لە نوێژەکانی خۆم بەردەوامم چ بەتەنیا یا لەگەڵ کۆمەڵ بیانکەم. شێخی بەڕێز، تکا دەکەم ئامۆژگاریم بکەن، چ پێویستە لەسەر من تاکو بیکەم؟

وەڵام: ئەگەر راستی واقیعەکە ئەوەیە کە باست کرد، تەوبەی ئێجگاری بەسە ئەویش ئەوەی پێشوو دەسڕێتەوەو هیچ شتێکیش لە نوێژو رۆژووەکان مەگێڕەوە چونکە تەوبەی ئێجگاری پێویست بەگەڕاندنەوەی نوێژوو رۆژووەکان ناکات و هیچ شتێکیش بۆ کفردانەوە



مەکە چونکە وازلێهێنان لە نوێژ لەراستی قسەی زانایان کفری گەورەیە ئەگەرچی لە ئاینیش دەرنەچووبێ بەڵام ئەگەر لە ئایین دەرچوو و بێ باوەڕی خۆی نواند پێویستە زانایان بە کۆمەڵ بڕیار لەسەر دەرچوون و بێ باوەڕی بدەن و کافریش ئەوەیە کە دەبێتە ئیسلام و هیچ شتێك لە ئەرکەکانی پێوەند بەخوای گەورە جێبەجێ ناکات، خوای گەورەو شکۆمەند دەفەرمووێت:

﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغۡفَرۡ لَهُم مَّا قَدۡ سَلَفَ وَإِن يَعُودُواْ فَقَدۡ مَضَتۡ سُنَّتُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ الانفال: ٣٨

واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: بە ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون، ئەگەر کۆتایی بهێنن (بەبێ بڕواییەکەیان)، بەراستی (خوا) دەبووریّ لە هەرچی لەوەو پێش کردوویانە.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: (بە ئیسلامبوون ئەوەی پێشتر دەڕمێنێت و دەسڕێتەوەو، تەوبەش ئەوەی پێش خۆی دەڕمێنێت و دەسڕێتەوە).

ئامۆژگاریت دەکەین لە تەوبەی خۆت راست و راستگۆبیت و، لە خوای گەورە زۆر داوای لێبووردن بکەو زۆریش کردەوەی چاك بکە،



ئەگەر لەسەر تەوبەو چاکەکاری خۆت بەردەوام بیت مزگێنییت لێبێ ئاکامی چاکی دەبێت و خوای گەورەش هەر بەخۆی خاوەن فرمانەو هەر بەخۆیش دانای زانایە. خوای گەورەش کە داهێنەری گشت زیندەوەرەکانەو بەرانبەریشیان زۆر بەسۆزو میهرەبانە، بە گەورەیی خۆی دەفەرموویت:

﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ﴾طـه: ٨٢.

واتە: وە بەراستی من زۆر لێبووردەم لەو کەسەی تەوبەی کردبێ، و باوەڕی هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێت، پاشان بەردەوام بووبێت لەسەر ئەو ڕێبازە.

لەخوای گەورە داواکارین رزقمان پتر بکاو لەسەر راست و ڕەوایی جێگیرمان بکات و بە گەورەیی خۆیشی ڕێی خواپەرستیمان بۆ ئاسان بکات.

لەپرسیارەکەی تۆ وشەیەك هاتووە پێویستە لێی هۆشیار بیت کە دەڵێ (قەزاو قەدەری دنیا وایکرد) قەزاو قەدەر کاریگەری بڕیاردەری نییە، راستی ئەوەیە بگوترێ: خوای تاك و تەنیا ویستی، یا خوای گەورە ئارەزووی لێبێ و هی دیکەی لەم جۆرە.







خوا ئێمەو ئێوە بۆ تێگەیشتن لە ئاینی سەرکەوتوو و سەرفراز بکات تاکو بتوانین لەم دنیایە پڕ گەندەڵییە رزگارمان بێت و بەدڵێکی پڕ لە بڕواو خواپەرستی‌و پێڕەوی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەرووسوور لەبەدەم سەکۆی لێپرسینەوە ئامادەبین، خودای پەروەردگاریش لەهەموو سات و زەمەنێك ئاگاداری بەندەکانی خۆیەتی، هەموو هاوارێك، داواکارییەك، نزایەك، پاڕانەوەیەك هەرچەند نزم بێت لە بەندەی خۆی دەبیسێت و لەهەموو گوفتاری نێوان بەندەکانیش ئاگادارە.

الشیخ ابن باز







# بەردەوامی لەسەر خواپەرستی

پرسـیار: مـن گـەنجێکم بـە ئیـسلامەوە پەیوەسـتکارم بـەڵام لـەم ماوەیەی دواییدا سـەرنجم دایـێ کـە بـڕوام لاوازە، بەبەڵگـەی ئـەوەی هەندێ شتە خراپـەکان دەکـەم وەکـو نوێـژ دواخـستن و نـەکردنیان و، گوێگرتن لە قسەی بێ ماناو دانیشتن و کات بەفیڕۆدانو، بەدوا ویستی خود کەوتن و، بێ ئاگابوون لە هەواڵی ژیانی رۆژانـەی موسـڵمانان و، گەڕان بەدوای چێژی خودو ویستی تاك و دوورکەوتنەوە لـە نێوەنـدی بیرو بۆچوونە ئایینییەکان و نزیکبوونەوەو یەکڕایی لەگـەڵ هاوڕێیـانی بڕوا لاوازو فەرامۆشکردنی خواناسان، زۆریـش هەوڵمـدا خـودی خـۆم لەوەی تێی کەوتووم رزگار بکەم و کەچی نەمتوانی، ئایا بـەڕێزتان بـۆ ڕێگای راست رابەریم دەکەن کە لەو بـەدخووەی خـودم تێـی کـەوتووە رزگارم ببێ؟

وەڵام: داوا لە خوای گەورە دەکەین، کە میهرەبـان و دەروون پـاك و خاوێنە، بەدڵێکی پڕ لە بڕواو خۆشەویـستیەوە، لێـی دەپاڕێینـەوە بـۆ خۆمـان و بـۆ تـۆش کـە ڕێگـای خواپەرسـتیمان نیـشان بـدات و



جێبەجێکردنی ئەرکەکانمان لەسەر ئاسان بکات، لەسەر خواپەرستی و خواناسی خۆمان مکوڕ و جێگیریان بکات، دوو دڵی نەخاتە دڵمانەوە، نەگریستی نەفرەتلێکراو درز نەخاتە بنەچەی ئیمانمانەوە، ڕاستگۆبین، دڵپاك بین، دەستپاك بین و لەسەر خوێندنەوەی قورئان و شیکردنەوەو تێگەیشتنی ئایەتەکانی ڕشت و مکوڕ بین، لە قورئانیشدا خوای مەزن دەفەرمووێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧﴾ یونس ٥٧.

واتە : ئەی خەڵکینە، بێگومان بۆتان هاتووە، ئامۆژگاری (قورئان) لەلایەن پەروەردگارتانەوە، وە شیفاو چارەیە بۆ ئەوەی لەناو دڵ و دەروونتان دایە، وە ڕێنموویی و میهرەبانیە، بۆ بڕواداران.

ئینجا لەخوای گەورە داواکارم تا لە تواناتدا بێت ژیاننامەی پێغەمبەر(ﷺ) و سوننەتەکەی بخوێنیتەوەو دووبارە پێدابچیتەوەو لێی ورد بیتەوە، ئەمەش مەشخەڵی ئەو ڕێگایەیە بۆ ئەو کەسەی بیەوێ



بەخوای مەزن بگات. سێیەمیش ئەوەیە باوەڕی چاکەکارو ئیمانـداران و هاوڕێیـــە خواناســـەکان بکـــەیت و لێیـــان دوور نەکەویتـــەوەو؛ چوارەمیش ئەوەی تا لـە تواناتـدا بێـت لـە کـۆڕی خراپـەکاران دوور بکەویتەوە کە دەربارەی ئەمانە پێغەمبەرمان دروودو سـەلامی خـوای لەسەر بێت فەرمووی:

(دانیشتن لەگەڵ کەسانی خراپەکار وەکو فووکـەری نێـو هەمبانـەی کوورەیە، یا دەتسووتێنێ، یا فەرمووی: جلو بەرگت دەسـووتێنێ، یـا بـۆنێکی گـەنیوت لـێ چـنگ دەکـەوێ) ئینجـا لەهـەر هـەنگاوێکی پێشکەوتنی خۆت کە تێیـدا خوورەوشـتت دەگۆڕێـت و چـاکتر دەبـێ سەرزەنشتی کارو کردەوەکانی ڕۆژانی پێشووی خـۆت بکـە کـە تێیـدا هەست بەشەرمەزاری دەکەیت، شەشەمیش: بەهەر کردەوەیەکی چاك، یا خێرێك، یا یارمەتیدانی برایەکی موسڵمان پێیەوە لە خۆیایی مەبەو لەلای خەڵکیش باسی چاکی و خێرو یارمەتیدانـەکانی خـۆت مەکـەو پێیانەوە سەرمەست مەبە کە تـۆ کردووتـەو کـە سـێکی دی نایکـات



چونکە باسکردنی ئەم جۆرە شتانە دەبنــە (ریـا) و ئەمــەش لەوانەیـە کردەوە چاکەکانت بەتاڵ بکات هەر وەکو خوای مەزن دەفەرموویێت:

﴿ يَمُنُّونَ عَلَيْكَ أَنْ أَسْلَمُوا قُل لَّا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُم بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿١٧﴾ ﴾ الحجرات: ١٧

واتە: ئەو کەسانە منەت دەکەن بەسەر تۆدا( ئەی موحەمــەد-ص-)، چونکە موسڵمان بوون، تۆش بڵێ منەتی موســڵمان بــوونی خۆتــان بەسەر مندا مەکەن، بەڵکو خوا منەت دەکات بەسەر ئێوەدا، چـونکە ڕێنموونی کردوون بۆ باوەڕهێنان، ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن(کە ئیماندارن).

بەڵام هەموو دەمێك سەیری کردەوە چـاکەکانی خـۆت بکـە وەکـو ئەوەی کە لە هەموو کارو کردەوەیەکی چاك، یا خێر، یا جووڵانەوە، یا دیدار، یا بیستن، چاودێری خۆت بیت و هەرچەند خواپەرستیش بکەیت و پتر خوای مەزن بناسیت وا هەست بکە هێشتا کەموکوڕیت هەیە تـا ئەو کاتەی دەگەیتــە ئــەو ڕادەیــەی بەرانبــەر خــودای گــەورە کڕنـۆش دەبەیەت بە دڵێکی ساف و بێ گەرد تەوبە دەکەیت، ئەی خودایــە لــە



گوناهەکانمان ببورە، ئەی خودایە بەکردەوەی خۆمانمان لەگەڵ مەکە هەر تۆ بەخشندەو میهرەبانیت هەر تۆ تاك و تەنیاو بێ هاوەڵ و هاوتایت، هەر تۆ پەروەردگارو زاتی پایەدارو دەسەڵاتداریت، هەر تۆ دەردو بەڵای دنیای بەدفەڕمان لەسەر هەڵدەگریت و داخوازیو پێویستیەکانمان جێبەجێ دەکەیت، ئەی خودایە هەر تۆ هاوتاو شێوەو هاوشانت نییە.

الشيخ ابن عثيمين






## لەو دانیشتنانەی قسەی پاشملەو بوختانی لێدەکرێت خۆت بپارێزە

پرسیار: لە گوندەکەی ئێمە زۆربەی گونجەکان کۆڕی قسان دەبەستن و تێیدا پاشملە باسی یەکدی دەکەن و بوختانیش بەخەڵکی دی دەکەن، ئایا دەکرێ بەشداری دانیشتنی ئەوانە بکەم؟

وەڵام: ئەم کۆمەڵە کەسانە کە شەو کۆڕی دەگرن و پاشملە باسی خەڵکی دەکەن و بوختانیش بەکەسانی دی دەکەن ئەمانە گۆشتی برایانی خۆیان دەخۆن، ئەمانە لەراستیدا بێ عەقڵن و کەودەن.

چونکە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ ﴾الحجرات:١٢

واتە: لە پاشملە بەخراپە باسی یەکدی دەکەن، ئایا کام لە ئێوە پێی خۆشە، کە گۆشتی برا(ئایینی یەکەی) بخوات، بەمردوویی، بێگومان قێزتان لێ دێتەوەو پێتان ناخۆشە.

ئەوانەی لە دانیشتنەکانی خۆیان گۆشتی خەڵك دەخۆن گوناهی ئێجگار گەورە دەکەن.



ئەوەی پێویستە لەسەرتۆ ئامۆژگارییان بکـەیت ئەگـەر گوێڕایـەڵت بوون و لەوەی دەیانکرد وازیان هێنا، ئەمە خێرێکی گەورەت کردووەو ئەگەر نا پێویستە تـا بکـرێ لێیـان دوور بکەوێتـەوە. خـوای گـەورە دەفەرمووێت:

﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾ ﴾ النساء: ١٤٠

واتە: وە بێگومان خوا ناردوویەتیە خـوارەوە بۆتـان، لـە قورئانـدا، هەر کاتێك بیستتان ئایەتەکانی (بەڵگەکانی) خوا، بڕوایان پێناکرێت، و گاڵتەیان پێ دەکرێت، ئەوە دامەنیشن لەگەڵیاندا، تـا دەچـنە نێـو باسـێکی تـرەوە (و باسـەکە دەگـۆڕن)، بێگومـان ئەگـەر دانیـشن لەگەڵیاندا (و هاوبەشیان بکەن) ئەوە ئێوەش وەکو ئـەوانن، بەڕاسـتی خوا کۆکـەرەوەی، دووڕووەکـان و بـێ باوەڕەکانیـشە، بـە تێکـڕا لـە دۆزەخدا.

ئینجا بە گوێرەی یاسای شەرع ئەوانەی لەگەڵ ئـەم جـۆرە کەسـانە دادەنیشن و گوێ بۆ ئەو ئایەتانە شل دەکەن کـە کفـری پـێ دەکـەن و



گاڵتەو سووکایەتی پێ دەکەن ئەگەرچی ئەمە مەسەلەیەکی مەزنە هەمیشە لادانو دەرچوونیشە لە رێبازی ئایین.

ئەوەی بەشداری یاخیبووان بکات لە شتی لەمانەش کەمتر وەکو ئەم یاخیبووانە کە نکۆڵی لە ئایەتەکان دەکەن و گاڵتەو سووکایەتییان پێدەکەن کە ئەمە خۆی لەخۆیدا کفرو لادانو دەرچوونە لە رێبازی ئایین ئەمانە لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیان دادەنیشن و گوێ بۆ قسەکانیان شل دەکەن وەکو یەکدی لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت و لە گوناهدا هاوبەشن.

تۆش پێویستە لەسەر لە دانیشتنیان جیا ببیتەوەو لەگەڵیان دانەنیشیت.

خودای گەوەر، سەرەتایەو، کۆتاییەو، دیارەو، شاراوەیەو، ئاگاداری هەموو شتێکە.

الشيخ ابن عثيمين







# هەستکردن بە پەسەند نەبوونی تەوبە

پرسیار: گەنجێك کردەوەیەکی خراپی کرد ئینجا تەوبەی کردو بەڵام لەناخی دڵی خۆیدا هەست دەکات خوا لێ خۆش نابێت، بەچی ئامۆژگاری دەکەن؟

وەڵام: تەوبەکردنتو هەستکردن کە خوای گەورە لە گوناهەکانی پێشووت خۆش نابێت ئەمە نیشانەی راست و راستگۆییە لەگەڵ خوای گەورە بەڵگەی ئەوەیە کە هەست دەکەیت و تەواو بڕوا دەکەیت کە لەبەرانبەر هەر گوناهێکی بەندە لێپرسینەوەو سزای خۆی هەیە. بەڵگەی ئەوەشە کە لە گوناهەکانی ماوەی پێشووی خۆت دەترسێیت، ئەم ترسەش هەڵبەتە ترسە لە خوای گەورە، پێویستە لەسەر تۆ ئەم ترسە لە دڵی خۆت دەربکەیت، چونکە شەیتانی بەدفەر لەو کەسانە نزیکە کە لە خوای خۆیان نزیك دەبنەوەو بەبێ باکی دەیپەرستن و ئەم شەیتانە هەموو دەمێك لەدەوری کەسانی چاك و خواناس دەخولێتەوە تاکو هەر دەرفەتێك ببینێت بۆ ئەوەی گومانی بخاتە دڵی و دەروونی تاکو بڕواو خواپەرستییەکەی لاواز بکات بەو ئومێدەی تەواو بیڕوخێنێت. تۆ کە تەوبەت کردووە دڵنیابە تەوبەکە بەسە تاکو ئەگەر پێشتر گوناهی گەورەشت کردبێ، ئەوەش بزانە کە هیچ گوناهێك لە هاوبەش پەیداکردن لەگەڵ خوای مەزن گەورەتر نییە



هاوبەش پەیداکاریش هەر کاتێ بۆ خوا تەوبەی کرد، تەوبەکەی لێوەردەگیرێت و خوای مەزن کە بە بەزەییدار ترینی بەزەییدارانە لە گوناهەکانت خۆش دەبێت، ئەوەی پێویست بووە لەسەر تۆ، تەوبەبووەو، ئەویشت کردووە، دوای تەوبەش هەموو شتێك، بەمانای هەموو گوناهەکانی ماوەی پێشتر دەسڕێتەوە، تەوبەکار لە گوناهەکانی پێشوو دەشۆرێت بە واتای وەکو ئەو کەسە کە تازە لە دایکدەبێت. ئیتر پێویست ناکات دوودڵی بخەیتە نێو مێشکی خۆتەوە، کاتێ دوودڵیش پتر شالاو بۆ کەسی موسڵمان دێنێ ئەگەر کەسەکە تەواو رۆشنبیر نەبیت و خوێندنەوەی قورئانی رەوان نەبێت و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ)نەزانێت لەوانەیە بڕواو خوا پەرستیەکەی درزی تێبکەوێت و ئیدی هەر کە بڕوای موسڵمان درزی تێکەوت چوونە ژوورەوەی شەیتانیش بۆ نێو دەروون ئاسان دەبێت.

کەواتە بەبێ ترس خوای گەورە بپەرستەو گوێ بۆ شەیتان شل نەکەیت، ئەوەش بزانە ئەوانەی تەوبەی ئێجگاری دەکەن کە لەگەڵ خوای گەورە راستگۆ دەبن بردنەوەی گەورە دەبەنەوە چونکە لەسەر رێبازی خواپەرستی بەردەوام بوونە، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ﴾طـه: ٨٢.

واتە: وە بەراستی من زۆر لێبووردەم لەو کەسەی تەوبەی کردبێ، و باوەڕی هێنابێ و کردەوەی چاکی کردبێت، پاشان بەردەوام بووبێ لەسەر ئەو ڕێبازە.

لێرەدا ئایەتێکی مەزنتر بەم مانایەوە هەیە ئەویش ئەوەیە کە هەرکاتێ بەندە تەوبەی کردو بەبڕوای تەواو بەدوای تەوبەکەدا چوو کردەوەی چاکی کرد، خوای گەورە کردەوە خراپەکانی بە چاکە دەگۆڕێتەوە، بە واتای لە شوێن هەر کارێکی خراپ چاکەیەك شوێنی دەگرێتەوە، هەروەکو خوای بەخشندەو میهرەبان لە سوورەتی (الفرقان) دا دەفەرمووێت:

﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الفرقان : ٦٨-٦٩-٧٠.



واتە: وە کەسانێکن کە لەگەڵ خوادا ناپەرستن، هیچ پەرستکراوێکی دی، و ناکوژن، هیچ کەسێ کـە خـوا کوشـتنی ئـەوی یاسـاغ(حـەرام )کردووە، بەهەق و ڕەوا نەبێ، وە زیناو داوێن پیـسی ناکـەن، وە هـەر کەس ئەو تاوانانە بکات( کە باسکران)، تووشی تۆڵەکەی دێت، سـزای بۆ چەند بارە دەبێتەوە، لە ڕۆژی قیامەتدا، و بێ بڕانـەوە بـەبێ ڕێـزو رسوایی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە، بێجگە لە کەسێ تەوبـەی کردبـێ و باوەڕی هێنابێ کارو کردەوەی چاکیـشی کردبێـت، ئـا ئەوانـە، خـوا خراپەو تاوانەکانیان دەگۆڕێت بە چاکە، وە خوا هەمیشە لێبووردەی بە بەزەیی یە.

خودای میهرەبان دەروون پاك و خاوێنـە، نیـازی پێـشینەی لەگـەڵ بەندەی خۆی نییە، خوای گەورە هێندە بـە سـۆزو میهرەبانـە، هێنـدە بەخشندەو بە بەزەیی یە، بەتەوبەی بەندەی خـۆی قایـل دەبێـت و لـە هەموو گوناهەکانی خۆش دەبێـت، دڵپـاکی و دەروون خـاوێنی خـوای مەزن نەپانتایی هەیەو نە سنوور.

خوای گەورەو سۆزەمەند خراپەی ئەوانـە بـەهۆی تەوبـەی ڕاسـت و دروستیان بە چاکە دەگۆڕێتەوە، هەر کردەوەیەکی خراپیان چـاکەیەکی







لە شوێن دادەنیێ، تۆش کە باسی کردەوە خراپەکانی خۆت کردووە لێیان تەوبەت کردووەو بەدڵ و دەروونێکی پاك و خاوێن دەستت بە ئیش و کاری چاك کردووە، خوای گەورەش بە گەورەیی و میهرەبانی خۆی کردەوە خراپەکانی ماوەی پێشووت بە چاکە دەگۆڕێ، بەم شێوەیە هەموو خراپەکان کە بەندە تەوبەیان لێدەکات و بەراستی روو لە خواپەرستی دەکاتو ئەوەی چاکەیە درێغی لێناکات خواش هەمووی بۆ بە چاکە دەگۆڕێت، کە ئەمەش لەگەڵ بەندەی خۆی دەکات لە چاکەو گەورەیی خۆیەتی، سوپاس و ستایشی بۆ خوای مەزن کە خۆی دانای زانایە.

الشیخ ابن باز







# تەوبەی کرد ئینجا گەڕایەوە سەر تاوانەکان

پرسیار: سزای ئەو تەوبەکارە چییە کە چەند جارێك لەسەر تاوانێك تەوبە دەکات کەچی دووبارەو سێبارە دەگەڕێتەوەو هەمان تاوان دەکاتەوەو دوای ئەمانەش خودای میهرەبان بە تەوبەی ئێجگاری چاکەی لەگەڵ دەکات و چیدیکە ناگەڕێتەوە سەر تاوانەکان؟ داوا لە بەڕێزتان دەکەین ئەمەمان تێبگەیێنن.

وەڵام: ئەم تاوانبارە تەوبەکەی ڕاستە، تەوبەکانی یەکەم و تەوبەکانی دوایی هەموو ڕاستن، چونکە هەر جارێك کە تاوانی کردووە لەلای خوا تەوبەی کردووە ئینجا دیسان تەوبەی بۆ خوا کردووەو مەرجەکانی تەوبەی تەواو کردووەو خوای گەورەش تەوبەکانی لێوەردەگرێت و پێی قایل دەبێت ئەگەر خودی خۆی پێ نەگیراو گەڕایەوە سەر تاوان و دیسان تەوبەی کردو دیسان کردەوەی خراپی کردەوەو دیسان تەوبەی کرد، ئەمەش لەفەرموودەی خوای گەورەدا هاتووە کە دەفەرمووێت:

﴿ ۞ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾الزمر: ٥٣.









واتە: ئەی موحەممەد(ﷺ) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە، نائومێد مەبن لە میهرەبانی و بەزەیی خوا، چونکە بێگومان خوا لەهەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت.

بەڵام گرنگ ئەوەیە کە تەوبەکە راست بێت و لەگەڵ خوای گەورە راستگۆ بێت و لە مەزنێتی خوای گەورە ترسی لە دڵ بێت، بڕیارێک بدات کە هەمیشە گەڕانەوەو پاشگەزبوونەوەو دوودڵی تێدا نەبێت، تەوبەش تەوبەی سەر زاری نەبێت کە لە نێو دڵی خۆی نیازی پاشگەزبوونەوەی لێهەبێت و دووبارە بگەڕێتەوە سەر هەمان گوناهەکان، لەم حاڵەتەش کە دەگەڕێتەوە سەر گوناهەکان تەوبەی یەکەمی بۆ دەنووسرێت و ئەگەر دیسان گەڕایەوە سەر گوناهەکان دووەمین تەوبەی بۆ دەنووسرێت و لەسەر گوناهەکانی دوای تەوبەکەی دوایی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت.

الشيخ ابن عثيمين








# تەوبەکردن و نوێژە چووەکان

پرسیار: من ماوەی چەند مانگێك لە نوێـژەکان دابڕابـووم و بـەڵام ئێستا سـوپاس و سـتایش بـۆ خـوای مـەزن گەڕاومەتـەوەو تەوبـەی ئێجگاریم کردووەو هەموو نوێژەکان لەکاتی خۆیان دەکـەم و هـەروەها من پێشتر بەڕۆژوو نەدەبووم و جیگارەشم زۆر دەکێشا ئێستاش تەوبەم کردووەو وازم لە هەموو کـارە خراپـەکان هێنـاوە، ئایـا گەڕاندنـەوەی نوێژەکان کە پێشتر نەمکردبوون پێویستە بیانگێڕمەوە یا نا؟

وەڵام: پیرۆزبایی لەو برایە دەکەم کە خـوای گـەورە بـە تەوبـەکردن چاکەی لەگەڵ کردووەو گەڕاوەتەوە سەر ڕێبازی ڕاست و ئـەوەی خـوا لەسەری پێویست کردووەو گەڕاوەتەوە سەر ڕێبـازی ڕاسـت و ئـەوەی خوا لەسەری پێویست کـردووە لـە نوێـژو ڕۆژوو بەچـاکی جێبـەجێیان دەکات، داوا لە خوای گەورە دەکەم کە لەسـەر بڕیـاری خـۆی جـێگیر بکـات و خێـرو چـاکەی زۆر بکـات و ئیمـانی بـداتێ و بمانخاتـە پـاڵ کۆمەڵەی چاکترین دڵنیاکار موحەممـەد پێغەمبـەر (ﷺ) ئینجـا مـن پێی دەڵێم: تەوبەکردنت لە گوناهەکان، گوناهەکانی پێشتر کە کردووتە دەیانـسڕێتەوە، تەوبـەکردنت لـە نوێژنـەکردن (لەوانـەی کـە پێـشتر بەسەرچووە) گوناهەکانی نوێژ نەکردنت دەسڕێتەوە، خـوای بەخـشندەو



میهرەبان بەم تەویەیەت لەسەرجەم گوناهەکانی سەردەمی پێشوو خۆش دەبێت بە فەرموودەی خوا کە لەم ئایەتەدا دەفەرمووێت:

﴿ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الزمر: ٥٣.

واتە: ئەی موحەممەد (ﷺ) بڵێ: ئەی بەندەکانم ئەی ئەوانەی کە خۆتان زۆر گوناهبار کردووە، نائومێد مەبن لە میهرەبانی‌و بەزەیی خوا، چونکە بێگومان خوا لەهەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت،

خوای گەورە لە وەسفی خواناساندا دەفەرمووێت:

قَالَ تَعَالَى: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾ آل عمران : ١٣٥-١٣٦



  

واتە: وە ئەوانەی  کە کاتێ کردەوەیەکی ناشیرین دەکەن، یـا سـتەم لە خۆیان دەکەن، کە یادی خوایـان کـردەوە، ئینجـا داوای لێبـووردن دەکەن بۆ گوناهەکانیان، ئایا کێ دەبورێ لە گوناهەکان، بێجگـە لـە خوا؛ وە بەردەوام نابن، لەسەر ئەوەی کە کردوویانە، لە کاتێکدا بـزانن (گوناهە)، ئا ئەوانە، پاداشتیان لێبووردنە، لەلایەن پەروەردگاریانەوە، و چەند باخاتێك (بەهەشـتێك)، کـە ڕووبارەکـان دەڕۆن بـە ژێریانـدا، ئەمێننەوە لـەو بەهەشـتانەدا بەهەمیـشەیی، چـەند چـاکە پاداشـتی چاکەکاران.

ئیتر بە گوێرەی ئەمە ئەو نوێژو ڕۆژووانەی کە پێشتر لێ ی چوون و نەیکردوون پێویست ناکات بیانکاتەوەو بەڵام ئێستا پێویستە لەسـەری لەسات و وەختی نوێژەکان ئاگاداربێت و ڕۆژووەکان هەمووی بگرێـت و دەست بەکردەوەی چاك بکـات و لەشـتی نادروسـت چـاو نەپۆشـێت و بەرانبەر قسەی پاشملەو بوختان و سوکایەتی بە ئیمانداران دەمی خۆی دانەخات و، دەمی بەبێ ناوهێنانی خـوای گـەورە نەکاتـەوەو هـەموو دەمێك  لەخوای میهرەبان بپاڕێتەوەو وەکو تەوبەکارێك بەشداری کۆڕە ئاینییەکان بکات و لە ئیماندارە چاکەکانیش نزیك ببێتەوە.



# پەشیمانی لە تەوبەشکاندن

پرسیار: مـن گـەنجێکم تەمـەنم (٢١) سـاڵەو مـاوەی چـوار سـاڵە ئاشنایەتیم لەگەڵ هەندێ گـەنجی ئیمانـدار پەیـداکردو خـوای گـەورە لەسەر دەسـتی ئەمانـە ڕێگـای ڕوونـاکی بـۆ کردومـەوەو سـوپاس و ستایش بۆ خوا کە لە ناسینی خودی خۆی ئاسانکاری بۆ کردم، لەگـەڵ ئەم برایە بەڕێزانە ماوەی نزیکەی ساڵ و نیوێك بەردەوام بووم و هـەر لەم ماوەیەش ئەوەی خوو و ڕەوشتی چاکی گـەنجی موسـڵمانە پێـڕەوم کرد، لەماوەی ئەم ساڵ و نیوە لەلایەن خزم و کەس و کارە نزیکـەکانم تووشی بێ ئومێدی بوومەوە چونکە لەهـەر جوڵانـەوەو کردەوەیـەك گاڵتەیان پێ دەکـردم و لـە هەنـدێ شـتی دیکـەش ڕسـواو سـووکیان دەکردمەوە، بەرگەی هـەموو ئەمانـەم گـرت، کەچـی دوای ماوەیـەك بەرانبەر ئەم شاڵاوەی خزمو کـەس و کـارم نـەمتوانی چـی دی بەرگـە بگـرم، وازم لـەم هاوڕێیانـە هێنـاو، گەڕامـەوە سـەر دۆخـی جـاران، لەمافەکانی خوا سل بوومەوەو فەرامۆشکرام، دەستم بە ئیش و کـاری خراپ کردەوە، لەوانەیە لەم پەشیمان بوونەوەیەو بەجێهێشتنی هاوڕێیە ئیماندارەکان بەڵایەکی گـەورەم بەسـەر خـۆم هێنابێـت و گونـاهێکی ئێجگار گەورەم کردبێ، ئێستاش من لەپەرۆشی و پەشیمانیدا دەژیـم، تکا لە بەڕێزتان دەکەم لەوەی من تێی کەوتووم ڕێگای دەربازبوونم بـۆ

دیاری بکەن، ئەو کتێبانەش چییە کە بـۆ خوێندنـەوەیان ئامۆژگـاریم دەکەن؟

وەڵام: پێویستە لەسەرت تەوبە بۆ خوای میهرەبان بکەیت.

راستییەکەشی: پەشیمانبوونەوە لـەوەی کردووتـە لـە گوناهـەکان، وازلێهێنانیان، هۆشیاربوون لێی، نیازو بڕیاری راسـتگۆ کـە جـارێکی دی لە ترسی خوا نەگەڕێیتەوە سەر ئەم گوناهانە، ئارەزووی راست لەو پاداشتەی کـە بەرانبـەر گەڕانـەوەت لەلایـەن خـوای دەسـەڵاتدارەوە وەردەگرێت.

تەواوی تەوبەش: ئەگەر ستەمت لە کەسێك کردبـوو، یـا شـتێ یـا مافی کەسێکت لەلا بوو، ستەمەکە لەسەر کەسەکە هەڵدەگریت و شت یا مافی کەسەکەش دەگەڕێنیتەوە یا مافەکەی دەدەیتەوە.

خوای شکۆمەند دەفەرموویێت:

﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣١ ﴾النور: ٣١.

واتـە: هـەمووتان تەوبـە بکـەن و بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا، ئـەی ئیماندارەکان، تا رزگارو سەرکەوتووبن.

هەمیشە خـوای گـەورە کـە داپۆشـەری کـەم و کـوڕی بەنـدەکانی خۆیەتی دەفەرموویێت:



﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيُدۡخِلَكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾التحرين : ٨.

واتە: ئەی ئەوانەی که باوەڕتان هێناوە، بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، بە گەڕانەوەیەکی ئێجگاری، تا پەروەردگارتان لـە گوناهـەکانتان خـۆش ببێت وە بتاغاتە نێو باخاتێکەوە، کـە دەڕوا بەژێریانـدا جۆگـە ئـاوی زۆر. هەمیـشە پێغەمبـەرمان (ﷺ) دەفـەرمووێت: (ئەمـەی لـەلای برایەکی خۆی ستەمێك لەناموس یا هەر شتێکی دی هەبوو تا زووەو کاتی بەسەر نەچووە با حەلاڵی بکات، ئەگەر کردەوەی چاکی هەبوو لە کردەوە چاکەکە بڕی ستەمەکە وەردەگیرێت و ئەگەر کردەوەی چاکیشی نەبوو کردەوە خراپەکانی ستەملێکراوەکەی لـێ بـار دەکرێـت.(أخرجـه البخاري في صحيحه).

زۆر لە ئایەت و فەرمودەی دیکەش بەم مانایەوە هەیە.

هەروەها ئامۆژگاریت دەکەم: گرنگی بە قورئانی پاکی کتێبی خـوا بدەیت و، کاری پێ بکەیت و، زۆر بیخوێنییتەوەو، لێی وردبیتەوەو پتر زەین لە ئایەتەکان بدەیت، ئەمـەش شـکۆدارترین کتێبـەو مـەزنترین کتێبەو، راستگۆترین کتێبە، هەر ئەمەش کتێبی خوای گەورەیـە کـە هیچ کەموکوڕی نییەو دابەزێنراوی دانای ستایـشکارە، هـەر ئـەویش







بەسوودترین کتێبەو لە بارەی نەخۆشیەکانی دڵ و کۆمەڵگەکان تەواو کارە هەروەکو خوای شکۆمەند دەفەرمووێت:

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ ﴾ الاسراء: ٩

واتە: بەراستی ئەم قورئانە ڕێنموونی دەکات، بۆ ڕێبازو بەرنامەیەك کە راستترینە.

هەمیشە خوای مەزن دەفەرمووێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِى ٱلصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾ یونس: ٥٧.

واتە: ئەی خەڵکینە، بێگومان بۆتان هاتووە، ئامۆژگاری (قورئان) لەلایەن پەروەردگارتانەوە، وە شیفاو چارەیە بۆ ئەوەی لەناو دڵ و دەروونتان دایە، وە ڕێنموونی و میهرەبانیە بۆ بڕواداران.

دیسان خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ ص:٢٩

واتە: (ئەم قورئانە) کتێبێکی پیرۆزە ناردوومانەتە خوارەوە بۆ تۆ، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە لە ئایەتەکانی وە خاوەنانی بیروژیری پەندی لێ وەربگرن.







دیسان ئامۆژگاریت دەکەم: کتێبەکانی خەڵکی سوننەش بەوردی بخوێنیتەوە.

لەمانە:

-التوحيد للشيخ محمد بن عبدالوهاب، رحمه الله.

-العقيدة الواسطية لشيخ الاسلام ابن تيمية.

-إغاثة اللهفان للعلامة ابن القيم.

-الاربعين النووية وتتمتها للحافظ ابن رجب.

-عمدة الحديث للشيخ عبدالغني بن عبدالواحد المقدسي.

-بلوغ المرام للحاظ ابن حجر.

-صحيح البخاري، ابن العباس زين الدين الزبيدي.

-صحيح مسلم، الامام زكي الدين عبدالعظيم عبدالقويم المنذري.



# پێرست





| | |
|---|---|
| لەو دانیشتنانەی قسەی پاشملەو بوختانی لێدەکرێت خۆت بپارێزە | [illegible] |
| هەستکردن بە پەسەند نەبوونی تەوبە | [illegible] |
| تەوبەی کرد ئینجا گەڕایەوە سەر تاوانەکان | [illegible] |
| تەوبەکردن و نوێژە چووەکان | [illegible] |
| پەشیمانی لە تەوبەشکاندن | [illegible] |

**نرخی (5000) دینارە**



